زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست (٤٥)



# ڕۆشن کردنەوەی چاوو دڵان بە ڕوناکی سوننەت و قورئان

وەڵامێك بۆ




ئامادەکردنی
م. عبدالغفور عبدالله صالح

پێداچونەوەی
م. عبدالکریم محمد قادر

پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی (ئیمان) لە سلێمانی

چاپی یەکەم

١٤٣١ کۆچی - ٢٠١٠ زاینی

زنجیرەی (٤٥) لە زنجیرە ڕێنماییەکانی ڕێگای ڕاست

ژمارە سپاردنی (٣٤٦)ی دراوەتێ لە لایەن وەزارەتی

ڕۆشنبیري حکومەتی هەرێمی کردستانەوە

بنکەی بڵاوکردنەوە:

کتێبخانەی سیما

چەمچەماڵ - بازاڕی بۆن فرۆشەکان

ژ.ت: ٠٧٧٠١٢٣٦٠٨٩ - ٠٧٤٨٠٢٠٣٠٢٦

کوردستانی عێراق

# ڕۆشن كردنەوەی چاوو دڵان
# بە ڕوناكی سوننەت و قورئان

## وەڵامێك بۆ

## گومڕاییەكانی
محمد بن علوي المالكي و
## هاوشێوەكانی


ئامادەكردنی

م.عبدالغفور عبدالله صالح

پێداچونەوەی

م.عبدالكريم محمد قادر

پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی (ئیمان) لە سلێمانی

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾ المائدة: ٣

**وەهەروەها دەفەرموێت:**

﴿ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمۡ عَنۡهُ فَٱنتَهُواْ ﴾ الحشر: ٧

## پێشەکی

نوسینی:

م.عبدالكريم محمد قادر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم النبيين نبينا محمد وعلى آلـه صـحبه أجمعين.

**خوێنەری بەڕێز:**

ئـەم (محمـد بـن العلـوي المـالكي)يـەو هاوشـێوەكانی، فـەقێكانی خۆيـان پـەروەردە ئەكـەن لەسـەر بـيرو باوەڕێك كـە پێـچەوانەی بـيرو بـاوەڕی پێغەمبـەر ﷺو هـاوەڵانی و زانايـان و شـوێنكەوتوانی سـوننەتن، لەوانـە هـەر چـوار ئيمـام و پێـشەوا بەڕێزەكە پێشەوايان (شافعي وأحمد ومالك وأبو حنيفة) ڕەحمەتی خوايان لێبێت.

وە بۆ زياتر ناسـينی (محمد بن العلوي المالكي) بفـەرمون لەگـەڵ پوختـەی بـيرو بـاوەڕە پوچەڵەكانی:

١. پاڕانەوە بـە دروسـت دەزانـێ لـە غـەيری خـوا؛ لـە پێغەمبـەران و پيـاو چـاكان، بـە (زيندوو مردويانەوە).

گومانی تيادا نيە كە پاڕانەوەش عيبادەتە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی: (الـدعاء هو العبادة) رواه الترمذي وقال حسن صحيح، كەواتە پاڕانەوە وەكو نوێژ عيبادەتە، جا ئايا نوێژ كردن بۆ غەيری خوا دروستە؟! بێگومان نەخێر، بۆيە پاڕانـەوەش لـە غـەيری خوا دروست نيەو بەڵكو شەريك بۆ خوا دانانەو شيركی گەورەشە، وە هەر كەسێك بـەم شێوەيە بمرێت و تەوبە نەكات جێگەی دۆزەخەو هەتا هەتاييە لە ناويدا.

٢. ئـەڵێن خـەڵکانێك هەنـە بـە نـاوی (أبـدال و أقطـاب و أوليـاء) کـە خـوای گـەورە هەڵسوڕاندنی دنیای داوەتە دەستیان، خوای گەورەش دەفـەرموێت کاتێـك پرسـیار لـە هاوبەش پەیداکەران بکرێت ﴿وَمَن يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ﴾يونس/٣١، سەیری لاپـەڕە (١٥٣)ی ئەم کتێبە بکە.

٣. ئەڵێن هیچ جیاوازی نیە لە نێوان خواو دروست کراوەکانیدا، هەموی دروست کراوەو هەمویـشی خوایـە، چـونکە ئـەڵێن –والعیـاذ بـالله– خـوا دەتوێتـەوە لەگـەڵ دروسـت کراوەکانیداو دەبن بە یەك.

٤. پلەی (الإحسان) کە بەرزترین پلەی ئیسلامە ئەیبەخشن بە مامۆستاکانیان، بۆیـشە بە (موریدەکانیان) ئەڵێن: ئەبێت هەموو کاتێك کە زیکری خوا ئەکـەن شـێخەکانتان لـە یاد بێت، تەنانەت لە کاتی نوێژ کردنیشدا.

شێخ (محمد بن جمیل زینۆ) فەرمویەتی: ناسراوێکم هەیە بینـیم وێنـەی شـێخەکەی لـە پێش خۆی دائـەنا لـە قیبلەیـدا لـە کـاتی نوێـژ کردنـدا. پێغەمبـەریش ﷺ فەرمویـەتی: (الإحسان أن تعبدالله كأنك تراه، فإن لم تكن تراه فإنه يراك)رواه مسلم.

٥. وە هەروەها ئەڵێن: خـوا پـەرستی نابێـت لەبـەر ترسـی ئـاگری دۆزەخ و بـە هیـوای چونە بەهەشت بێت، وە خوای گەورەش مەدحی پێغەمبـەرانی (عليهم الصلاة والسلام) کردووە بەوەی کە داوای چونە بەهەشتیان کردووەو پەنایان بە خوا گرتـووە لـە سزای دۆزەخ، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗا﴾الأنبياء/٩٠. واتە: (ئەوان هـەموویان لـە کـاری خێـرو چـاکەدا بەردەوام پەلەیان ئەکردو هەمیشە لەبـەر هیـوای ڕەحمـەتی ئێمـەدا نزایـان ئـەکردو لـە ترسی دۆزەخیش هاواریان ئەکردو پەنایان ئەگرت بە خوا).

٦. سەما کردن و دەف لێدان و دەنگ بەرز کردنەوە لە کـاتی زیکـری خـوادا بـە حـەڵاڵ دەزانـن، خـوای گـەورەش دەفـەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ

﴿ قُلُوبُهُمْ ﴾ الأنفال/٢. واتە: (باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەوانەن كە هەر ناوی خوا هێنرا دڵیان لەبەر گەورەیی خوا ئەكەوێتە لەرزو ترسی لێ ئەنیشێت).

وە هەروەها دەنگ بەرزكردنەوە لەكاتی زیكری خواو دوعا كردندا قەدەغە كراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱدْعُوا۟ رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾ الأعراف/٥٥. واتە: (بە كزی و پەنامەكی لە خوای خۆتان بپاڕێنەوە، بەڕاستی خوای گەورە ئەو كەسانەی خۆش ناوێت كە زۆر دەنگیان بەرز ئەكەنەوەو لە سنوری خوا دەرئەچن و هاوار ئەكەن لە كاتی زیكرو دوعادا).

٧. لە كاتی زیكر كردنیاندا ناوی (مەشروب و سەرخۆشی ئەهێنن)، شاعیرەكەیان (ابن الفارض) ئەڵێ:

شربنا على ذكر الحبيب مُدامة سكِرنا بها من قبل أن يخلق الكَرْم

وە لێیان بیستراوە كە لەناو مزگەوتدا ئەو هۆنراوەیان وتوە:

هات كأس الرَّاح واسقنا الأقداح

(المدامة والرَّاح: ناوی دوو جۆر مەشروبە).

وە گومانی تیادا نیە كە مزگەوت بۆ زیكری خوا دروست ئەكرێت نەك بۆ ناو هێنانی مەشروب تیایدا.

٨. گۆرانی وتن بە ناوی ئافرەتان و خۆشەویستی و عیشق و لیلی و سُعاد، وەك ئەوەی لە شوێنی مەشروب خواردنەوە دانیشتبن، (سەماكردن و باسی مەشروب و لەگەڵ چەپڵە لێدان وهاوار كردن) كە ئەمانە پیشەو خوو ڕەوشتی هاوبەش پەیداكەرەكانە (المشركين) لەكاتی عیبادەتیاندا.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ﴾ الأنفال: ٣٥، واتە: (نوێژو پاڕانەوەیان لە لای (كەعبە)دا تەنها هەر فیكەو چەپڵەو هەراو هۆسەیە)، (مكاء: فیكە، تصدية: چەپڵە لێدان).

٩. لە خۆدان بە ئاسن؛ كە ئەمەش لە شیعەوە وەرگیراوە نەك لە قورئـان و سـوننەتی پێغەمبەر ﷺ، جاری واش هەیە ئەو كەسانە نوێژیش ناكەن، ئیتر چۆن بە ستەم ناوی (كەرامەت)ی لێ بنرێت؟!!

١٠. پڕوپاگەندەی زانینی زانیاریە نهێنیەكان (علم الغیب) ئەكەن، قورئانیش بە درۆیان ئەخاتەوە.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ ﴾ النمل: ٦٥، واتە: (ئەی محمد ﷺ پێیـان بڵـێ: هـیچ دروستكراوێك لەوانەی لـە ئاسمانەكان و زەوی دان –بێجگە لە خوا– ئاگایان لە غەیب نیە).

١١. گومانی بەتاڵیان پێیان ئەڵێت: خوای گەورە (محمدی ﷺ لە نوری خۆی دروست كردووە، پاشـان لـە نـوری محمـد ﷺ هـەموو دروستكراوەكانی تـری دروست كـردووە. قورئانیش بە درۆیان ئەخاتەوە.

خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ﴾ الكهف: ١١٠، واتە: (ئـەی محمـد ﷺ پێیـان بڵـێ: منـیش تـەنها مـرۆڤێكم وەك ئێـوە، وەحیم بۆ دێت كە پێتان بڵێم: بەڕاستی تەنها الله پەرستراوی بە حەقی ئێوەیە).

وە دەربارەی ئـادەم علیـە الـسلام خـوای گـەورە فەرمویـەتی: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴾ ص: ٧١، واتە: (ئەو دەمەی كە پەروەردگاری تۆ بـە فریـشتەكانی فەرموو: وا لە قورِ مرۆڤێك دروست دەكەم، واتە: ئادەم پێغەمبەر علیه السلام).

وە حەدیثی (أول ما خلـق الله نـور نبیـك یـا جـابر) كـە ئـەوان دەیكـەن بـە بەڵگـە بـۆ شوبهەكەیان فەرمودەیەكی مەوضوع و بەتاڵە.

١٢. وە وا گومان دەبەن كە گوایە خوای گەورە دنیای لەبەر محمد ﷺ دروست كردووە، وە قورئانی پیرۆزیش بە درۆیان ئەخاتەوە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦، واتە: (بۆیە جنۆکەو ئادەمیم دروست کردووە بۆ ئەوەی بە تەنهاو بە حەق بم پەرستن).

وە حەدیثی (لولاك ما خلقت الدنيا) ئیمام السيوطي فەرمویەتی: (حدیث موضوع) (اللآلئ المصنوعة في الأحاديث الموضوعة ج١ص٢٧٢).

١٣. گومانیان وایە کە خوای گەورە لە دنیادا ئەبینرێت، قورئانیش بە درۆیان ئەخاتەوە کاتێك کە موسا علیه السلام داوای کرد خوایە خۆتم نیشان بدە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى ﴾ الأعراف: ١٤٣، خوای گەورە فەرموی: هەرگیز لەم دنیایەدا تۆ ناتوانی بم بینی.

١٤. گومانیان وایە پێغەمبەر ﷺ ئەبینن لە دنیادا بە زیندویی، وە قورئانیش بە درۆیان ئەخاتەوە.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ المؤمنون: ١٠٠، واتە: (هەتا ڕۆژی زیندوو بونەوە لەمپەرێکی زۆر گەورەیان لە پێشدایەو ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دنیا)، ابن کثیر فەرمویەتی: مجاهد فەرمویەتی: (البرزخ: الحاجز مابين الدنيا والآخرة).

هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێ بێت کەسیان نەیان وتووە پێغەمبەر ﷺ ئەبینین لە دنیادا بە زیندویی لە دوای مردنی پێغەمبەر ﷺ، ئایا ئەمان لە هاوەڵان چاکترن لای خوا؟!! بێگومان نەخێر.

١٦. گومانیان وایە ڕاستەوخۆ زانیاری لە خواوە وەرئەگرن، وە قسەیەکیان هەیەو دەڵێن: (حدثني قلبي عن ربي).

ئەمەش درۆیەکی ئاشکرایەو کەس ناتوانێت ڕاستەوخۆ زانیاری لە خواوە وەربگرێت، تەنها پێغەمبەران نەبن عليهم الصلاة والسلام.

١٧. کۆڕ ئەگرن و ئاهەنگ ئەگێڕن بە بۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا گوێڕایەڵی سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ناکەن، وە سرودەکانیان بە ئاشکرا شیرکی تێدایە کە بۆ دەربڕینی خۆشەویستی بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەیڵێن.

١٨. زۆر دەمار گیرن بۆ شێخەکانیان، وە ئەگەر قسەشیان پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت ئەوا بە گوێڕایەڵی شێخەکانیان دەکەن نەك قورئان و سوننەت.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ الحجرات: ١، واتە: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، پێش بڕیاری خواو پێغەمبەری خوا ﷺ مەکەون لە هیچ کارێك لە کاری دین و دنیادا، وە لە خۆتانەوە بڕیار مەدەن و قسەی هیچ کەسێك پێش قسەی خواو پێغەمبەر ﷺ مەخەن.

١٩. نوشتە دەنوسن و لەناو نوشتەکانیاندا ژمارەی جیاوازو هێڵ کێشانی تایبەت ئەنوسن، کە ئەمانەش هەموویان بیدعەن.

وە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (وإياكم ومحدثات الأمور، فإن كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة) صحيح رواه أبو داود وابن ماجه. واتە: (ئاگاتان لە خۆتان بێت لە هەموو داهێنراوەکان لە دیندا، وە دڵنیا بن هەموو داهێنراوێك لە دیندا بدعەیەو هەموو بدعەیەکیش گومڕاییە).

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی: (مَن عَلَّقَ تَميمةً فقد أشرك) صحيح رواه أحمد. (تميمة: واتە: هەر شتێك هەڵبواسرێت بە مەبەستی پاراستن لە چاوی پیس، جا ئیتر نوشتە بێت، مورو بێت، دار بێت، بەرد بێت، ناڵەکەر بێت، هەڵی بواسێت بە ماڵەکەیدا یان بە سەیارەکەیدا یان بە منداڵەکەیدا یان بە خۆیدا هەمووی شیرکە).

٢٠. ملکەچی شێوەی صەحیحی صەڵاوات نابن لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیەی کە لە حەدیثە صەحیحەکاندا هاتووە.

بەڵکو هەریەکەیان جۆرێك صەڵاوات دەڵێن کە زۆری شیرکی تێدایە.

٢١. ئـەڵێن:دنیـاو قیامـەت لـە بەخـشینی پێغەمبـەرە ﷺ، وە قورئـانیش بـە درۆیـان ئەخاتەوە.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ ﴾ الليل: ١٣، واتە: (بێگومان ئەم دنیاو ئەو دنیاش هەر بۆ ئێمەیە).

مانای (الولي) لای محمد العلوي المالكي و هاوبیرو باوەڕەکـانی بریتیـە لـەو کەسـەی کـە لەسەر گۆڕەکەی گومەزێکی گەورە هەبێت یان گۆڕەکەی لەناو مزگەوت دابێت، پاشـان زێوانی بۆ دابنرێت و تەنها ئیشی بریتی بێت لە هۆندنەوەی کۆمەڵێك قسەو بیداتـە پـاڵ مردووەکە، کە ئەگونجێت زۆری ڕاسـت نـەبێت و دروسـتکراو بێـت، هـەروەکو چـۆن لـە (مصر – حضرموت – سوريا – عيراق) و شوێنەکانی تر زۆرە.

وە دروستکردنی گومەزو نەزرگا لە داهێنراوەکانە بە ناوی ئیسلامەوەو ئەگەڕێتـەوە بـۆ (درۆ) تا خەڵکی دور بخەنەوە لە مزگەوت و زۆریـش لـەو نەزرگایانـە دروسـت کـراون و ڕاست نین.

بۆ نمونە گۆڕی إمام حسين ﷺ لـە مـصر نیـەو درۆیـە، چـونکە ئـەو لـە عێـراق شـەهید کراوە.

وە لە لایەکی ترەوە بوونی گۆڕ لەناو مزگەوتدا لە کردەوەی جولەکەو گاورەکانە، بۆیـە پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی لەعنەتی لە گاورو جولەکە کردووە، چونکە گۆڕیان خستە ناو شوێنی خوا پەرستیانەوە، وە لەسـەر گـۆڕی پێغەمبـەران علـيهم الـصلاة مزگـەوت دروست کرا.

پاشانیش زۆرێك لـە موسـوڵمانان مردویـان لـەناو مزگەوتـدا ئەخـستە نـاو قـەبر، وە بـە تایبەتیش ئەوانەی کە هەڵئەستان بە دروست کردنی مزگەوتەکە.

دواتریش خەڵکەکە لە مردوی ناو مزگەوتەکە ئەپاڕانەوەو ئەیانکرد بە شەریکی خوا.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾ الجن: ١٨، واتە: (مزگەوتەکان تایبەتی خوان، جا لەگەڵ خوا هاوارو هانا بۆ کەسی تر مەبەن، وە تەنها خوا بپەرستن تیایانداو هاواریش تەنها لە خوا بکەن).

مزگەوت لە ئیسلامدا شوێنی مردوو ناشتن نیەو نابێت بکرێت بە ۆرستان، چونکە مزگەوت تەنها شوێنی نوێژ کردن و قورئان خوێندن و زیکری خوایە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: (لاتجالسوا على القبور ولاتصلوا إليها)رواه مسلم/٩٧٢، واتە: (لەسەر گۆڕ دامەنیشن و لە کاتی نوێژیشدا ڕوو مەکەنە گۆڕ).

**مانای (الولي) لە قورئاندا:**

وەلی بە کەسانێك ئەوترێت کە ئیماندارو لە خوا ترس بێت و بە ئەنقەست پێچەوانەی شەرعی خوا نەکات و شەریك بۆ خوا بڕیار نەدات.

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴾ یونس: ٦٢ – ٦٣، واتە: (چاك بزانن و وریابن کە دۆستەکانی خوا هیچ ترسیان لەسەر نیە بۆ دوا ڕۆژیان و خەفەتباریش نابن بۆ دنیای پاش خۆیان، دۆستی خوا ئەوانەن کە باوەڕی تەواویان هێناوەو بەردەوامیش لە خوا ترسن و بە پێی فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ کار دەکەن).

وە هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت: ﴿إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ ﴾ الأنفال: ٣٤، واتە: (تەنها خۆ پارێزانن کە دۆستی خوان).

دۆستی خوا نین ئەو کەسانەی کە نوێژ ناکەن، یان بەردەوامن لەسەر گوناهو تاوان کردن، قوروان تەنها مەرجی ئیمان و تەقوای داناوە بۆ دۆستەکانی خوا، وە مەرج نیە کەرامەت لەسەر دەستی ئاشکرا بێت، بەڵکو کەرامەت ڕێزێکە خوای گەورە ئەیبەخشێت بە بەندەکانی لە کاتی پێویستدا.

**لە کۆتاییدا ئەڵێم:**

خوێنەری بەڕێز:

ئەو نوسراوەی بەر دەستت کە لە ئامادەکردنی برای بەڕێزو خۆشەویستم (م.عبدالغفور عبدالله)یە، وەڵامێکە بۆ (محمد بن العلوي المالكي)و هاوشێوەکانی لە بیرو باوەڕداو ئاشکرا کردنی گومڕاییەکانیان.

بۆیە بە پێویستمان زانی کە بیخەینە بەر دەستی بەڕێزتان بە ئومێدی ئەوەی کە ڕووناکیەك بێت بۆ دڵەکانتان و ڕۆشن کردنەوەی چاوەکانتان بێت و وووریابن و بە فڕوفێڵی ئەم جۆرە کەسانە فریو مەخۆن کە بە چەواشەکاری بەناوی ئیسلامەوە ئەیانەوێت ڕۆڵەکانمان گومڕا بکەن و بە درۆ خۆیان بە خەمخۆری ئیسلام ئەزانن.

وە تەنها مەبەستمان لەم نوسینەو نوسینەکانی تری دواییدا ڕەزامەندی خوایەو گەیاندنی ڕاستیەکانە بە ڕۆڵەی موسوڵمانان و دیفاع کردن لە حەقیقەتی ئیسلام، وە لە لۆمەی لۆمەکارانیش ناترسین پشتیوان بە الله کە شەریکی نیە لە هیچ شتێکدا.

خوای گەورە جەزای خێری نوسەرو خوێنەران بداتەوە بەو شێوەیەی کە خوا خۆی ئەیبەخشێت بە بەندەکانی.

**چاوەڕوانی نوسینی پاك و وەڵامی ڕاست بن لە داهاتوودا إن شاء الله.**

٢٧/١٠/١٤٢٠هـ



**پێشەکـی:**

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا إنه من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله .

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾[1].

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾[2].

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾[3].

أما بعد:

فإن أصدق الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد ﷺ، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

بەڕاستی خـوای پـەروەردگار بـۆ هـەموو ئوممـەتێك لەسـەر ڕووی زەوی پێغەمبـەرێکی ناردووە بۆ ئەوەی بنچینەکانی دینیـان بۆ ڕوون بکەنـەوەو فێری تەوحیـدو بـە تـەنها پەرستنی خوای گەورەو باڵا دەستیان بن، وە هەروەها هەرچی شیرك و کوفرو هاوبەش بـۆ خـوا دانانیـشە بـۆ خـوای گـەورە لێـی دوور بکەونـەوەو خۆیـانی لـێ بپـارێزن،

---

(١) سورة آل عمران:( ١٠٢).

(٢) سورة النساء: (١) .

(٣) سورة الأحزاب: (٧٠-٧١).

وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ ﴾[1]، واتە: (بەڕاستی بۆ هەموو ئوممەتێك پێغەمبەرێكمان ناردووە بۆ ئەوەی بە قەومەكەی ڕابگەیەنێت كە بە تەنها خوا بپەرستن و دووركەونەوەو خۆیان بپارێزن لە تاغوت و پەرستنی غەیری خوا).

هەر لەم سۆنگەیەشەوە خوای گەورە بۆ ئەم كۆتا ئوممەتە پێغەمبەرێكی بۆ ناردوون هەر لە خۆیان بۆ ئەوەی لە زۆنگاوی كوفرو شیرك ڕزگاریان بكات و بانگیان بكات بۆ بە تەنها پەرستنی خوای گەورە كە ئەنجامەكەی بەهەشت و ڕەزامەندی پەروەردگارە، وە بۆ هاوەڵێتی كردنیشی باشترین نەوەو سەردەمی هەڵبژارد بۆ ئەوەی پشتی بگرن و لەگەڵیدا تێ بكۆشن بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

وە هەروەها لە ماوەی (٢٣) ساڵی زێرینی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا ﷺ ئەم ئایینە پیرۆزەی بەسەردا تەواو كردو هەموو بنەماكانی بە تەواوی بۆ ئوممەتەكەی ڕوون كردەوەو ئەویش ﷺ وەك پێشەنگێكی چاك و لەبەر چاوی هاوەڵانی هەمووی خستە بواری جێ بەجێ كردنەوەو هاوەڵانیش ڕەزای خوایان لێ بێت بە هەمان شێوەی ئەو، ئەمەش بۆ ئەوەی كەس نەڵێت جێ بەجێ كردنی ئەم ئایینە قورس و گرانەو لە توانای مرۆڤەكاندا نیە، وە هەروەها بە شێوەیەكیش هاوەڵانی بەجێ هێشت كە هیچ لێڵی و تەمومژێك لەسەر ئایینەكەی نەبێت وەك دەفەرموێت: (قد تركتكم على البيضاء ليلها كنهارها لا يزيغ عنها بعدي إلا هالك)[2].

(وە هەروەها خوای گەورە واجبیشی كردووە لەسەرمان كە گوێڕایەڵی ئەوو گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بكەین، وە خوای گەورە كۆمەڵێك حەق و مافی بۆ خۆی داناوە لەسەر بەندەكانی كە هیچ كەسێك هاوبەش نیە لەگەڵیدا نەپێغەمبەران و نێردراوان و نە

---

(١) سورة النحل: (٣٦).

(٢) صحيح: صحيح سنن ابن ماجه (٤١).

فریشتە نزیکەکان، وە هەروەها کۆمەڵێك مافیشی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ داناوە کە هیچ کەسێك یەکسان نیەو وەك ئەو نیە لە دروست کراوەکانیدا.

پێشەوا ابن القیم دەڵێت:

لله حـــق لیـــس لعبـــده ولعبده حـق هما حقـــان

لا تجعلوا الحقين حقاً واحداً مـن غيـر تمييز ولا فـرقان

وە حەق و ماف پێغەمبەریش ﷺ لەسەرمان ئەوەیە کە خۆشمان بوێت و گوێڕایەڵی بکەین و شوێنی بکەوین و ڕێزی بگرین و بە گەورەی دابنێین بەبێزیادەڕەوی کردن و تێپەڕاندن، وە دەفەرموێت ﷺ: (لا تطروني كما اطرت النصارى ابن مريم، فإنما أنا عبد، فقولوا عبدالله و رسوله)[١] ، واتە: (زیادە ڕەوی مەکەن لە مەدح کردنی مندا وەك چۆن گاورەکان زیادە ڕەویان کرد لە کوڕی مەریەم سەلامی خوای لێ بێت لە بە گەورە دانان و مەدح کردنیدا هەتا گەیشتە ڕادەیەك کە جگە لە خوای گەورە دەیان پەرست؛ بەڵکو من بەندەی خوامەو بڵێن: بەندەو نێردراوی خوایە)، وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ نەهیشی لێ کردوین کەوا بیدعە لە دیندا دابهێنین وەك دەفەرموێت: (وإياكم ومحدثات الأمور فإن كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة)[٢] واتە: (وە خۆتان بپارێزن لە کاری داهێنراو، لەبەر ئەوەی هەموو داهێنراوێك بیدعەیەو هەموو بیدعەیەکیش گومڕاییە)[٣].

بەڵام لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺو کۆتایی هاتن بەو سێ سەدە پڕ خێرەی کە پێغەمبەر ﷺ شاهێدی بۆ داون کە باشترین سەدەو سەردەمن، بەرە بەرە گروپە لادەرەکان لە قورئان و سوننەت سەریان هەڵداو ئەهلی بیدعەو بیدعەکاران زۆربوون و خەڵکیان خستە ناو گێژاوی بیدعەوەو موسڵمانانیان پارچە پارچە کردو کردیانن بە

---

(١) صحيح: اخرجه البخاري (٣٤٤٥)، ومسلم (١٦٩١)و أخرجه مالك في (موطئه)في الحدود (١٥٥٨)، وأحمد (٣٩١)، وأبو داود (٤٤١٨)، والترمذي (١٤٣٢)، وابن ماجه (٢٥٥٣)، وغيرهم.

(٢) صحيح: أبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٢٦٧٦)، وأحمد (١٢٦/٤)، وصححه إمامنا الألباني (رحمه الله) في (السلسلة الصحيحة)(٢٧٣٥)، (صحيح الجامع)(٢٥٤٩).

(٣) تقريظ الشيخ صالح بن فوزان بن عبدالله الفوزان لكتاب حقوق النبي ﷺ بين الإجلال والإخلال.

چەندین گروپ و تاقمەوە کە هەر یەکەیان دڵخۆش بوون بەوەی کە لە سەری بوون بێ ئاگا لەوەی کە لەسەر بیدعەن.

(وە یەکێ لە خراپترین جۆرەکانی ئەو بیدعەو گومڕاییەی کە سەری هەڵداو شەڕو فیتنەکەی بەشێوەیەکی زۆر بەربڵاو بڵاو بۆوەو بەرۆکی ئوممەتی ئیسلامی گرت و عەقڵی زۆرێك لە خەڵکی تێکدا، بیدعەی صۆفیەت و تەصەوف بوو لەگەڵ ئەو هەموو شیرك و خورافەو کارە بێ بنەمایانەی کە تیایدابوون، وە هەر ئەو تاقمەش هۆکارو یارمەتی دەر بوون بۆ بڵاوبونەوەی قەبرپەرستی و زیادەڕەوی لە پیاو چاکانداو داوای بە فریاکەوتن و یارمەتی لێیان و باوەڕ بوون بەوەی کە ئەوان غەیب دەزانن و لەگەڵ خوای گەورەدا دەستیان هەیە لە بەڕێوەبردنی گەردوندا، وە چەندەها گومڕایی گەورەتریش کە لە ژماردن نایەن)[1].

وە یەکێ لەو کەسانەی کە ئەمڕۆ لە جیهانی ئیسلامیدا هەڵگری ئەم بیدعە شەڕو خراپەیەو دەعوەو بانگەوازی بۆ دەکات و هەوڵی زیاتر بڵاو کردنەوەی دەدات (دکتۆر محمد بن علوي المالكي)یە! ئەگەرچی ئەویش بە تەنها نیەو وردە دەروێشی زۆری بە دەورەوەن و لێرەو لەوێ بەشان و باڵیدا هەڵدەدرێت و بە (فضیلة الشیخ العلامة) ناودەبرێت!!! وە وتەکانی وەك قەوانێکی سواو لێ دەدرێتەوەو کتێب و بڵاوکراوەکانیشی بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر بە وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاو دەکرێنەوە وە هیچ سانسۆرێکیشی لەسەر نیەو لەگەڵ ئەوەشدا چارەنوسی ئوممەتی ئیسلامی و موسڵمانان دەخاتە مەترسیەوە.

وە ئەم پیاوە هەر بەوەوە نەوەستاوە کە لە کۆڕە تایبەتیەکانی قسە بکات و بەس، بەڵکو چەندین کتێب و بڵاوکراوەی هەیە کە تیایاندا ژەهری شیرك و کوفرو بیدعەی ڕشتووەو هەوڵی بڵاوکردنەوەیان دەدات، وە لە بڵاوترین کتێبەکانی کە پڕن لە شیرك و کوفرو قسەی بێ بنەما هەردوو کتێبی (الذخائر المحمدیة) وە (شفاء الفؤاد

---

(١) كشف زيف التصوف وبيان حقيقته وحال حملته، لشيخ العلامة ربيع بن هادي المدخلي.

بزيـارة خـير العبـاد)ن، كـە هـەموو لاپـەڕەكانی ڕەش كردونەتـەوە بـە سەرپێـچی فەرمانـەكانی خـوای گـەورەو زيـادەڕەوی كـردن لـە پێغەمبـەران و پيـاو چـاكانداو هەڵوەشاندنەوەی هەموو بنەماكانی دين، وە تيايـاندا:

- ✓ لە دەيان شوێنی ئەم كتێبانەيدا هەستاوە بە هەڵوەشاندنەوەو دژايەتی كردنـی تەوحيدو بە تەنها پەرستنی خوای گەورەو بانگەشە كردن بۆ شيرك و هاوبەش بۆ خوا دانان.
- ✓ وە درۆو بوهتـان كـردن بـە بـەناوی خـوای گـەورەو پێغەمبـەر ﷺو فريـشتە بەڕێزەكانی.
- ✓ گۆڕينی مانای ڕاستـەقينەی ئايەتـەكانی خـوای گـەورەو تـەحريف كردنيـان لـە چەندەها شوێن بە پێی ڕاو بۆچون و لێكدانەوەی خۆی و بەناو پێشەواكانی.
- ✓ وە هێنانەوەی چەندەها شوبهەو گومان بـۆ زيـاتر ڕازاندنـەوەی ئـەو كـارە پـڕو پوچ و بەتاڵانەی كە خۆی و هاوشێوەكانی لەسەری دەڕۆن بۆ چەواشـە كردنـی موسڵمانان.

وە لێـرەدا بـە پێويـستی دەزانم كـە ئامـاژە بـەوە بكـەم كـە ئـەم كتێبـەم لەسـەر خواست و داوای مامۆستای ئازيزو خۆشەويستم (م.عبدالكريم) پێش نوێژو وتار خوێنی مزگەوتی ئيمان ئامادە كردووە، كە داوای لـی كـردم كتێبێـك ئامـادە بكـەم بـۆ ئـەوەی وەڵامێك بێت بۆ ئەم پياوەو هاوشێوەكانی، لەوانەی كەوا لاف و گەزاف بە قسەكانيەوە دەكەن، بۆ ئـەوەی بـزانن كـە ئـەم پيـاوەی ئـەوان كردويانـە بـە پێشەنگ و پێشەوای خۆيان و بە (زانای بەڕێزو پايە بـەرز) نـاوی دەبـەن، پيـاوێكی گومڕايـەو كەوتۆتـە نـاو گێژاوو زۆنگاوی بيدعەو شيرك و خواڕافەوەو نوسينەكانی دژايەتی كردنی ڕاستەوخۆيان تيادايە لە بەرامبەر ئەو دينە ڕاستەقينەی كەوا پێغەمبەر ﷺ هێناويەتی.

وە منـيش بـە پـشتيوانی خـوای گـەورە دەسـتم پـێ كـرد، وە بنـچينەو سەرچـاوەی سەرەكيشم لە نوسين و ئامادەكردنی ئەم كتێبە، كتێبێكە بەناونيشانی (جلاء البـصائر في الرد على كتابي شفاء الفؤاد والذخائر)ە، كە لە نوسينی (سمير بن خليل المـالكي)يـە،

كـە دەكاتـە كـوڕە ئـامۆزای ئـەم (محمـد العلـوي)يـەی كـە ڕەددی دراوەتـەوە، لەگـەڵ بەكارهێنانی چەند سەرچاوەیەكی تر كە لە كۆتایی كتێبەكـەدا ئاماژەیـان پـێ دەكـەین إنشاءالله.

وە دووبارە سوپاسی مامۆستای خۆشەویستم (م.عبدالكريم) دەكەم كە لە پـاش تـەواو بوونی كتێبەكەم دەرفەتی پێدام و پێداچونەوەی كتێبەكەی گرتـە ئەسـتۆی خـۆی، بـۆ ئەوەی شتێك پێشكەشی خوێنەرانی خۆشەویستی كورد زمان بكەین كە ئەوەنـدەی لـە تواناادا بێت دوور بێت لە هەڵەو كەمو كووڕی، خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشـتی مامۆستای بەڕێز بداتەوە لەسەر ئەرك و ماندوو بوونی.

**وە خوێنەری بەڕێز:**

ئەوەی بەر دەستت كاری مرۆڤـە، بـە دڵنیاییـەوە بـێ كـەمو كـووڕی نابێـت، بۆیـە لەوەیاندا كە صەوابەو ڕاستە داوای خێرو پاداشت دەكەم لە خوای گەورە لەسەری، وە داوای لـێ خـۆش بـوونیش دەكـەم لـە خـوای گـەورە لـەوەی كـەوا هەڵەیـەو دركـم پـێ نەكردووە هەتا ڕاستی بكەمەوە، وە تۆش دەتوانی لای خۆت ڕاستی بكەیتەوەو بەهـەر ڕێگەیـەكیش بێـت مـن ئاگـادار بكەیتـەوە بـۆ ئـەوەی لـە چاپەكانی داهـاتوودا ڕاسـتی بكەینەوە بە پشتیوانی خوای گەورەو باڵا دەست.

وصلی الله علی نبينا محمد وعلی آله وصحبه وسلم

**ئامادەكار**

١٨/ شعبان /١٤٣٠ كۆچی

٩/ ئاب /٢٠٠٩ زاینی

# بە تەنها خوا پەرستی

هیچ گومانی تێدا نیە کە ناردنی پێغەمبەران و بنچینەی بانگەوازی کردونیان تەنها بریتی بووە لە پەرستنی خوای گەورەو بە تەنها دانانی لە عیبادەت بۆ کردنداو بە پاك دانان و ڕاگرتنی لە هاوەڵ و هاوبەش بۆ داناندا لە هەموو ڕوویەکەوە، وە هیچ شتێکیش نەکرێت بە هاوبەش و هاوەڵی، جا ئەو شتە پێغەمبەران بن یان پیاوچاکان یان فریشتەکان یان بەردو دارو بت و .....هتد، وە مرۆڤەکانیشی دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەنجام دان و جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە نەبێت کە پەرستنیەتی بە تەنهایی، وە بەڵگەشمان زۆرە چ لە قورئانی پیرۆزو چ لە فەرموده صەحیحەکانی پێغەمبەر ﷺ، لەوانەش:

١- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾[1] واتە: (جنۆکەو مرۆڤەکانم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە بە تەنها بم پەرستن)

٢- خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾[2]، واتە: (بەڕاستی بۆ هەموو ئوممەتێك پێغەمبەرێکمان ناردووە بۆ ئەوەی بە قەومەکەی ڕابگەیەنێت کە بە تەنها خوا بپەرستن و دوورکەونەوەو خۆیان بپارێزن لە تاغوت و پەرستنی غەیری خوا، جا لەناویاندا هەندێکیان هیدایەتیان وەرگرت و شوێن پێغەمبەران کەوتن و هەندێکیشیان شوێن ڕێچکە

(١) سورة الذاريات: (٥٦).

(٢) سورة النحل: (٣٦).

گومڕاکان و هەواو ئارەزوەکانی خۆیان کەوتن، دە کەوایە بە لاشـەو دڵـەکانتان بە زەویدا بڕۆن ئنجا دەبینن عاقیبەت و داهـاتووی کەسـانی درۆزن چۆنە، کـە جگە لە بە هیلاك چوون هیچی تر نیە).

٣- خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[1] واتـە: (بەڕاسـتی ئێمە (نوح)مان نارد بۆ لای قەومەکەی و پێـی وتـن: ئـەی قەومەکـەم بـە تـەنها خوای تاك و تەنها بپەرستن، چونکە بەڕاستی جگە لـەو هـیچ پەرسـتراوێکی تـر نیە بە حەق؛ بەڕاستی من دەترسم لە عەزاب و سـزای ڕۆژێکـی زۆر گـەورە کـە توشتان دێت).

وە هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت یەکەم شتێك کـە قەومەکـەیان بـۆ بـانگ دەکردن ئەوەبوو کە پێیان دەوتن: ﴿ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ﴾ هەروەك (نوح و هودو صالح و شـعیب و ابـراهیم و موسـی و عیـسی و محمـدو هـەموو پێغەمبـەران) سەلامی خوایان لێ بێت وتویانە[2].

وە بە هەمان شێوە کۆتـا پێغەمبـەریش ﷺ بـۆ هـەمان شـت بانگـەوازی قەومەکـەی و هەموو خەڵکی دەکرد، وە فەرمانی پێ دەکردن بە تـەنها پەرستنی خوای گەورەو وتنی (لا إله إلاّ الله)، بەڵام پشتیان هەڵکرد تـەنها کـەمێکیان نـەبێت کـە ئیمانیـان هێنـا، وە هەروەها نامەی بۆ پاشاکان دەناردو بانگی دەکردن بـۆ بـە تـەنها خـوا پەرسـتی، هـەر وەك لـەو نامەیـەی هـاتووە کـە بـۆ (هرقـل)ی نـارد: (و ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ

(١) سورة الأعراف: (٥٩).

(٢) (الإرشاد الى صحيح الإعتقاد تأليف الشيخ صالح بن فوزان الفوزان ص١٧).

كَلِمَةٍ سَوَآءِۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾[1] ).

وە هەروەها كاتێكیش ویستی (معاذ) بنێرێت بۆ یەمەن پێی فەرموو: (تۆ دەچیت بۆ لای قەومێك كە ئەهلی كیتابن، وە با یەكەم شتێك كە بانگیان دەكەیت بۆلای شاهێدی دانی ئەوە بێت كە هیچ پەرستراوێكی بە حەق نیە جگە لە (الله) وە من واتە: (پێغەمبەر ﷺ) نێردراوو پێغەمبەری خوام)، وە لە ووتەیەكی تردا هاتووە (بۆ عیبادەت كردن بۆ خوای گەورە)، وە لە ووتەیەكی تردا (بۆ بە تەنها دانانی خوای گەورە)[2].

وە هەموو ئەو ئایەت و فەرمودە پیرۆزانەو جگە لەوانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە دەبێت خوای گەورە بە تەنها بپەرسترێت و هاوەڵ و هاوبەشی بۆ دانەنرێت، وە هەر ئەوەش بنچینەی دین و مانای ڕاستەقینەی ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾یە، وە وەك پێشتریش ـمان هەر ئەمە بانگەوازی گشت پێغەمبەران بووە سەلامی خوایان لێ بێت، چونكە ئەوە ئەو ئیسلامە ڕاستەقینەیە كە خوای گەورە پێی ڕازیە، وەك دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾[3] واتە: (بەڕاستی تاكە دین كە لە لای خوای گەورە وەر بگیرێت دینی ئیسلامە)، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾[4] واتە: (بەڕاستی هەر كەسێك لەسەر غەیری دینی ئیسلام بێت ئەوا خوای گەورە لێی قەبوڵ ناكات و لە دوا ڕۆژیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندان دەبێت).

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٣٢/١) ومسلم (١٧٧٣) والآية في آل عمران: ٦٤.

(٢) صحيح: رواه البخاري(٢٦١/٣) و (٣٢٢/٣) و (٣٤٧/١٣) ومسلم (١٩).

(٣) سورة آل عمران:( ١٩).

(٤) سورةآل عمران: (٨٥).

وە هـەروەها بـۆ قـەبوڵ بـوونی ئـەو عیبـادەت و پەرستنانەش کـە بەنـدە ئـەنجامیان دەدات پێویستە چەند مەرجێك هەبێت، ئەوانیش ئەمانەن:

١. (صـدق العزيمـة): واتـە: بـوونی عەزیمـەتێکی ڕاسـت لەسـەر گوێڕایـەڵی کردنێکـی کردەوەیـی و واقیعـی، بـە بـەجێهێنانی فەرمانـەکان و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکان، کە ئەمەش مەرجی بوونی عیبادەتە.
٢. (الإخلاص لله): واتە: بوونی ئیخلاصێکی پاك و تەواو بۆ خوا لە پەرستندا، دوور لە ڕیایی و شەریك بۆ خوا دانان.
٣. (موافقـة الـسنة): واتـە: بـوونی پێکـاو پێکیـەکی تـەواو (الموافقـة) لەگـەڵ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە خوا پەرستنەکەدا، بۆ ئەوەی خوا پەرستیەکە دوور بێت لە بیدعەو داهێنراو.

وە دوو مەرجی دواییش مەرجی گیرابوونی عیبادەتەکـەن، واتـە کـە هـەر کـام لـەم دوو مەرجە نەبن؛ ئەوا عیبادەتەکە گیراو قەبوڵ نابێت.

وە ئەم ئایەتەش (الکهف ١١٠) بەڵگەیـە لەسـەر هەرسـێ مەرجەکـە: ﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ

١. فَلۡيَعۡمَلۡ ..........................(صدق العزيمة)
٢. عَمَلٗا صَٰلِحٗا ........................(موافقة السنة)
٣. وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا﴾..............(الإخلاص لله)[1].

---

(١) بە کەمێك کورت کردنەوەوە وەرگیراوە لە کتێبی خوا پەرستی نەك شەخس پەرستی نوسینی م.عبـداللطیف أحمد مصطفى لاپەڕە (١٧).

## موشریكەكانیش دەیان ووت
## خوا ئێمەی درووست كردووە

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾

وە ئەو موشریكانەی كە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ بۆ ناردن دانیان دەنا بە بوونی خوای گەورەو بە پەروەردگارو جێ بەجێكاری هەموو كردارەكانیان دادەنا، وە دەیان ووت هەر خوا دروستكارو ڕۆزی دەرو ژێنەرو مرێنەرە، وە ئەو پەرستراوانەی كە ئەوان دەیان پەرستن هیچ كام لەم كارانەیان پێ ناكرێت، بەڵكو لێیان دەپاڕانەوەو پەنایان پێ دەگرتن بۆ ئەوەی شەفاعەتیان بۆ بكەن لەلای خوای گەورە، وە دەیان كردن بە واسیتەو تەوەسولیان پێ دەكردن بۆ ئەوەی پێداویستیەكانیان لە ڕێگەی ئەوانەوە بگەیەنن بە خوا، وە وا گومانیان دەبرد كە خوای گەورە وەڵامیان ناداتەوە تاوەكو ئەو پەرستراوانەی كە هەیان بوون شەفاعەتیان نەكردبا لای خوای گەورە، وە بەڵگەشمان لەسەر ئەوە زۆرە، لەوانە:

١. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾[1] واتە: (بەو موشریك و هاوبەش دانەرانە بڵێ: كێ ڕزق و ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمانەكان و زەوی؟ وە كێ بیستن و بینینی دروست كردووەو خاوەنیەتی؟ وە كێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت؟ وە كێ تەدبیری هەموو كاروبارەكان دەكات و بەڕێوەیان دەبات؟ ئەوا لە وەڵامدا دەڵێن: (الله)، ئنجا پێیان بڵێ: ئەی كەوایە بۆ لە خوا ناترسن و عیبادەت تەنها بۆ ئەو ئەنجام نادەن؟).

---

(١) سورة یونس: (٣١).

٢. وە هـــــەروەها دەفـــــەرموێت: ﴿ قُل لِّمَنِ ٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ ﴾[1]، واتـــــە: (بەوانە بڵێ کـە زیـندوو بوونـەوە بـە درۆ دەزانـن: زەوی و ئـەوەی کـە تیایدایـەتی کـێ دروستی کردووەو خاوەنیەتی؟ ئەوا دەڵێن: (الله)، وە ئەگـەر دانیـان بـەوەدانا، پێیـان بڵێ: ئـەی کەوایـە بـۆ بـیر ناکەنـەوەو ناگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوای گـەورە، وە هـەروەها دیسان لێیان بپرسە: کێ پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکانە؟ وە کێ پـەروەردگاری عەرشـی گەورەیـە؟ دیـسان لـە وەڵامـدا دەڵـێن: خـوای گـەورە پـەروەردگاری هـەموو ئەمانەیە، ئنجا پێیان بڵێ: ئەی کەوایە بۆ لە خوای گـەورەو تـاك و تـەنها ناترسـن؟ وە هەروەها پێیان بڵێ: ئـەی کـێ خـاوەنی هـەموو ئـەو شـتانەیە کـە لـە گـەردووندا هەنـە لەوەی کە دەیانبینین و ئەوەش کە نایان بینین؟ وە هـەر ئـەو شـەڕو بەڵاو ناڕەحـەتی لەسەر بەندەکانی لا دەبات، و کەس ناتوانێت ئەمانە لەسەر خۆی لاببات، وە هیچ کەس ناتوانێت بەبێ ئیزنی ئەو شەفاعەت بکـات، لـە وەڵامـی ئەمەشـدا دەڵـێن: هـەمووی بـە دەستی خوای گەورەیە، ئنجا تۆش پێیان بڵێ: ئەی کەوایـە عـەقڵ و ژیریتـان بـۆ کـوێ چووەو بۆچی بە تەنها خوا ناپەرستن؟).

وە هەروەها دانان و گێڕانی بت و پەرستراوەکانیان بـە شـەفاعەتکارو واسیتە بـۆ لای خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانە دەیانگرێتەوە:

١. خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي

(١) سورة المؤمنون: (٨٤ – ٨٩)

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾[1] واتـــە: (موشـــریكەكان جگە لە خوای گەورە عیبادەت بۆ شتێك دەكەن كە نە قازانجیان پیێ دەگەیەنێت وە نە زەرەریشیان لەسەر لادەبات، وە دەڵێن: ئەمانە شەفاعەتكارمانن لای خواو لـە خوامـان نزیك دەخەنەوە، وە ئایا ئێوە ڕێگا بۆ خوا دادەنێنن و شـتێكی فێـر دەكـەن كـە خـۆی نەیزانێت؟ بەڵكو خوای گەورە زاناو شارەزایە بە هەموو ئەو شتانەی كە لە ئاسمانەكان و زەویدان، وە پاك و بێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی كە موشریك و هاوبـەش دانـەران دەیكەن و دەیڵێن).

٢.وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾[2] واتە: (ئایا ئەو موشریكانە جگە لـە خـوای گـەورە ئەوانـەی كـە دەیان پەرستن دەیان كەن بە شـەفاعەتكارو هاواریـان دەكـەنێ تـا پێـی لـە خـوا نزیك ببنەوە؟ ئەی محمد ﷺ بـەو موشـریكانە بڵـێ: ئایـا ئەوانە بـە شـەفاعەتكاری خۆتـان دەزانن لە كاتێكدا هیچیان بە دەسـت نیـەو ئاگاشـیان لـە هـاوار كردنـی ئێـوە نیـە، وە پێیان بڵێ: شەفاعەت هەمووی موڵكی خوایەو هەر خۆی خاوەنیـەتی، وە هـەر ئـەویش خاوەنی ڕاسـتەقینەی زەوی و ئاسمانەكانـە، وە لـە كۆتاییـشدا گەڕانـەوە هـەر بـۆ لای ئەوە).

لە ئایەتی یەكەمدا خوای گەورە هەواڵ دەدات دەربارەیان كە هۆی پەرستن كردنیان بۆ پەرستراوەكانیان ئەوەیە كە بیان كەن بـە تكاكـارو شـەفاعەتكار، وە خـوای گـەورەش كردەوەكەیانی بە شـیرك و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان دانـا، وەك فـەرموی: ﴿ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾.

---

(١) سورة يونس: (١٨).

(٢) سورة الزمر: (٤٣ – ٤٤).

وە ئایــەتی دووەمــیش تەئکیــدو جــەخت کردنەوەیــە لەســەر یەکــەم، وە ڕوون کردنەوەیەکی ترە بۆ ئەوەی کە بەڕاستی شەفاعەت هەر هەمووی هی خوایەو بە دەست خوایەو هی هیچ یەکێك لە دروست کراوەکانی نیە، وە بە تەنها موڵکی ئەوەو بە ویستی خۆیەتی دەیدات بە کێ و بۆ کێی دەکات، بە پێچەوانەی شەفاعەت و واسیتەی خەڵکی بۆ یەکتری لە نێوان خۆیاندا لە دنیادا، وەك شەفاعەت و واسیتەی کەسێك لای سەرۆکێك، کە ئەم شەفاعەتە شایانی لاوازی و بێ دەسەڵاتی دروست کراوەکانە، وە شــەفاعەتی خــوای گــەورە شایستەو شــایانی گــەورەیی و تــەواوەتی و دەســەڵات و شــەهامەت و دەوڵەمەنــدی خــوای گەورەیــە بەســەر دروســت کراوەکانیــەوە، وە هــەر کەسێك ئەم دوو جۆری شەفاعەتانە تێکەڵ بکات و وەك یەکیان حیساب بکات، ئـەوا بەڕاستی هەڵەیەکی زۆر گەورەو ڕوون و ئاشکراو درۆو بوهتانێکی گەورەی کردووە.

# سەرەتای سەرهەڵدانی هاوەڵ و شەریك بۆ خوا دانان

دیارە سەرەتای سەرهەڵدانی شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دانان دەگەڕێتەوە بۆ قەومی نوح سەلامی خوای لێ بێت، هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴾[1] واتە: (موشریکەکان دەیان وت: واز لە پەرستراوەکانتان مەهێنن، واز مەهێنن لە وەددو سواع و یەغوث و یەعوق و نەسر).

ابن عباس ڕەزای خوای لێ بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: (ئەوانە ناوی پیاو چاکانی قەومی نوح بوون، کاتێك مردن شەیتان هات بۆ لای قەومەکەو پێی ووتن کە لەو شوێنەی ئەوان لێی دادەنیشتن پەیکەریان بۆ دروست بکەن و بە ناوی ئەوانەوە ناویان بنێن، ئەمانیش ئەمەیان کرد بەڵام نەیان پەرستن، هەتا ئەو کاتەی ئەوانیش مردن و پاش ئەوانیش عیلم و زانستیان دەربارەیان نەماو پەرستیانن)[2].

وە یەکەم کەسێکیش کە لەناو عەرەبدا دەستی دابێتە بت پەرستی (عمرو کوڕی لُحَيٍّ کوڕی قمعة الخزاعي)[3] بووە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە جارێك چوو بۆ شام و خەڵکەکەی بینیوە بتیان پەرستووە، ئەویش دانەیەکی لەگەڵ خۆی هێناوەو لە کەعبە دایناوە، ئەو بتەش هوبەل بووە).

---

(١) سورة نوح:( ٢٣).

(٢) رواه البخاري (٨/٦٦٧).

(٣) رواه مسلم (٢٨٥٦).

# ڕێگری كردن لە هۆكارەكانی هاوبەش بۆ خوا دانان

بێ گومان بۆ گەیشتن بەهەر مەبەست و ئامانجێك پێویستە دەست بگیرێت بە چەند هۆكارو ڕێگایەكەوە، وە ئەو هۆكارو ڕێگایانەش بەشێكی گرنگن لەو مەبەست و ئامانجەی كە هەوڵی بۆ دەدرێت. بۆ نمونە ئەگەر خوای گەورە شتێكی حەرام كردبێت لەسەر بەندەكانی، ئەوا ئەو هۆكارو ڕێگایانەش كە دەیان گەیەنێت بەو شتە حەرام و قەدەغە كراوە، ئەویش حەرامە.

وە هەموشمان دەزانین كەوا شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دانان لە گەورەترینی تاوانەكانە، بۆیە پێویستە ڕێگری بكەین لە هەموو ئەو ڕێگاو هۆكارانەی كە سەر دەكێشن بۆ شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان، وە گەورەترین ئەو هۆكارانەش بریتین لە سوڕانەوەو مانەوە لەسەر قەبری پیاو چاكان و بە گەورە دانیان و زیادەڕەوی كردن لە خۆشویستن و بە گەورە دانیاندا.

وە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێدا كە سەرەتای شیرك و هاوەڵ بۆ خوا دانان دەگەڕێتەوە بۆ قەومی نوح سەلامی خوای لێ بێت، ئەویش بە هۆی مانەوەو داواكردن و پاڕانەوە لەسەر قەبری پیاو چاكان، كە ئەوانیش (ود و سواع و یغوث و یعوق نسر) بوون.

وە عیبادەت كردنی گاورەكان بۆ عیسی سەلامی خوای لێ بێت و عیبادەت كردنی جولەكەكانیش بۆ (عُزَیر) سەلامی خوای لێ بێت، هەمووی هۆكارەكەی بریتی بوو لە زیادەڕەوی كردن لە بە گەورە دانان و بەرزكردنەوەیاندا، هەر بۆیەشە بەڵگەی زۆر توندو ورياكەرەوە هاتوون لەسەر ڕێگرتن لەم دوو هۆكارە، ئەوانیش: بە گەورە دانانی قەبرو زیادەڕەوی كردن لەو كەسانەی كە لەناو قەبرەكان دان واتە (پیاو چاكان).

# قەبرەکان مەکەن بە مزگەوت و شوێنی سوجدە بردن بۆ خوا

## ألا فلا تتخذوا القبور مساجد

وەك پێشتر وتمان یەکێك لە گەورەترین ئەو هۆکارانەی کە سەر دەکێشێت بۆ قەبر پەرستی و هاوەڵ بۆ خوا دانان و کردنی ئەو قەبرە بە بتێك و جگە لە خوای گەورە بپەرسترێت، بریتیە لە مانەوە لای و سەردان کردنی بۆ نوێژ لێ کردنی و پاڕانەوە لێی و پەرستن بۆ کردنی و هەموو ئەو عیبادەتانەی کە بۆ خوای گەورەو لێ نزیك بونەوەی ئەنجام دەدرێن.

وە لەم ڕووەوە فەرمودەی زۆر هاتون بۆ نەهی کردن و ڕێ گرتن لەم کارە، وە دەستەواژەی زۆر توند هاتووە لە بەرامبەریدا وەك لەعنەت و کوشتن و تووڕە بوون، وە هەروەها ئەنجام دەرەکەشی بە خراپترین دروستکراو لای خوای گەورە وەصف کراوە، لەم فەرمودانەش:

١. لە ئەبو مرثد الغنوي ڕەزای خوای لێ بێت پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لا تجلسوا على القبور ولا تصلوا اليها)[1]، واتە: (لەسەر قەبرەکان دامەنیشن، وە ڕووەو ئەویش نوێژ مەکەن).

٢. وە لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (أن النبى نهى عن الصلاة الى القبور)[2]، واتە: (بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە کە نوێژ ڕووەو قەبرەکان بکرێت).

٣. وە لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێت: (ئوم حەبیبەو ئوم سلمە ڕەزای خوایان لێ بێت بۆ پێغەمبەریان ﷺ باس کرد کەوا لە حەبەشە کەنیسەیەکیان بینیوە وێنەی تیادا بووە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (إن أولئك إذا كان فيهم الرجل

---

(١) صحيح: أخرجه مسلم (٩٧٢).

(٢) صحيح:أخرجه ابن حبان (ح٣٤٣) وصححه إمامنا الالباني (رحمه [illegible]) (صحيح [illegible]).

الصالح فمات بنوا على قبره مسجداً و صوروا فيه تلك الصور، فأولئك شرار الخلق عندالله يوم القيامة)[1] ، واتە: (ئەوانە ئەگەر پیاو چاکێك لەناویاندا بوایەو پاشان بمردایە، لەسەر قەبرەکەی مزگەوتیان دروست دەکرد، پاشانیش ئەو وێنانەیان تێدا دروست دەکردن، ئا ئەوانە خراپترین دروست کراون لای خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا).

٤. وە لە (عائیشە)ەوە ڕەزای خوای لیٚ بێت وتویەتی: پێغەمبەر ﷺ لەکاتی تووش بوونی بەو نەخۆشیەی کە لێی هەڵنەستایەوە فەرمووی: (لعن الله اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[2] ، واتە: (خوای گەورە لەعنەتی کردووە لە جولەکەو گاورەکان، گۆڕی پێغەمبەرانیان دەکرد بە مزگەوت) ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە هەر لەسەرە مەرگیدا فەرموویەتی: (لعنة الله على اليهود والنصارى اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[3]، واتە: (لەعنەتی خوا لە جولەکەو گاورەکان بێت کە گۆڕی پێغەمبەرانیان دەکرد بە مزگەوت).

٥. وە لە (جندب کوڕی عبدالله)ەوە ڕەزای خوای لیٚ بێت کە پێغەمبەر ﷺ بە پێنج ڕۆژ پێش مردنی فەرمویەتی: (ألا وإن من كان قبلكم كانوا يتخذون قبور أنبيائهم وصالحيهم مساجد، ألا فلا تتخذوا القبور مساجد، إني أنهاكم عن ذلك)[4] ، واتە: (بەڕاستی ئەوانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون قەبری پێغەمبەرەکانیان و پیاو چاکانیان دەکرد بە مزگەوت، ووریابن ئێوە قەبرەکان مەکەن بە مزگەوت، بەڕاستی من نەهیتان لیٚ دەکەم لەسەر ئەو کارە).

٦. وە لە (ابو هريرة)ەوە ڕەزای خوای لیٚ بێت ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: (اللهم لا تجعل قبري وثناً، لعن الله قوماً اتخذوا قبور أنبيائهم

---

(١) صحيح:أخرجه البخاري (٥٢٣/١)، ومسلم (٥٢٨).

(٢) صحيح: البخاري (٢٠٠/٣) ومسلم (٥٢٩).

(٣) صحيح: أخرجه البخاري (٥٣٢/١) ومسلم (٥٣١).

(٤) صحيح: أخرجه مسلم (٥٣٢).

مساجد)[1] ، واتە: (خوایە گیان قەبرەکەم نەکەیت بە بتێك، خوای گەورە لەعنەتی کردووە لە قەومێك کە قەبری پێغەمبەرەکانیان دەکرد بە مزگەوت).

٧. وە لە (عطاء کوڕی یسار)ەوە ڕەزای خوای لێ بێت کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (اللهم لا تجعل قبري وثناً يعبد، اشتد غضب الله على قوم اتخذوا قبور أنبيائهم مساجد)[2] ، واتە: (خوایە گیان قەبرەکەم نەکەی بە بتێك و بپەرسترێت، توڕەیی خوا زۆرە لەسەر قەومێك کە قەبری پێغەمبەرانیان دەکرد بە مزگەوت).

وە پێشەوا ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەربارەی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ قەبرو ئەو فەرمان و نەهیانەی کە کردونی لەسەری و هەروەها ئەوەش کە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت لەسەری بوون، لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی خەڵکی ئەمڕۆ لەسەری دەڕۆن پێچەوانەیە لەگەڵ یەکتریدا، وە هەروەها ئەم دوانەش بەیەکەوە کۆنابنەوە.

وە هەروەها کۆمەڵێك بابەتی هێناوە کە پێغەمبەر ﷺ نەهی لێ کردون کەچی خەڵکێکی زۆر ئەمڕۆ ئەنجامیان دەدەن، لەوانەش:

أ. پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە کە نوێژ ڕووەو قەبران بکرێت، کەچی ئەوان نوێژ ڕووەو قەبران دەکەن.

ب. وە هەروەها نەهی کردووە کە قەبرەکان بکرێن بە مزگەوت، کەچی ئەوان مزگەوت لەسەر قەبرەکان دروست دەکەن.

ت. وە هەروەها نەهی کردووە لەوەی کە چراو ڕووناکی لەسەر قەبر دابگیرسێنرێت، کەچی بە پێچەوانەوە ئەوان چراو ڕووناکی لەسەر دادەگیرسێنن.

ث. وە هەروەها نەهی کردووە لەوەی کە بگەڕێنەوە بۆ سەریان و بیانکەن بە شوێنی عیبادەت، کەچی ئەوان کردوویانن بە شوێنی عیبادەت و لە بۆنەو

---

(١) صحيح: رواه أحمد (٢/٢٤٦)، وصححه إمامنا الالباني (رحمه الله) في (احكام الجنائز).

(٢) صحيح: رواه مالك في الموطأ (١/١٧٢) مرسلاً، وصححه إمامنا الالباني (رحمه الله) في (مشكاة المصابيح) (٧٥٠).

یادەکان کۆدەبنەوە لێی هەروەك چۆن لە جەژنەکان کۆدەبنەوەو زیاتریش لەوە.

ج. وە هەروەها فەرمانی کردووە بە تەخت کردنی قەبرەکان، کەچی ئەوان لەڕووی زەویەوە بەرزیان دەکەنەوە وەك خانوو وە گومەزیان لەسەر دروست دەکەن [1].

وە هەروەها ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (زانایان دەڵێن: هۆی ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لەوەی کە قەبری ئەوو جگە لەویش بکرێت بە مزگەوت، ترسان بووە لەوەی کە زیادەڕەوی بکرێت لە بە گەورە دانانیانداو خەڵکیش بە هۆیەوە توشی فیتنەو بەڵاو هاوبەش بۆ خوا دانان بن، وە زۆر جاریش لە ترسی ئەوەی کە سەر بکێشێت بۆ کوفرو بێ باوەڕی) [2].

وە شێخ أحمد البنا الساعاتي دەڵێت: (ئەم فەرمودانە بەڵگەنە لەسەر ئەوەی کە حەرامە قەبری پێغەمبەران و پیاو چاکان بکرێن بە مزگەوت، چونکە نوێژ کردن تیایاندا شوێن کەوتنی سوننەتی جولەکەو گاورەکانە، وە بە ڕاستی ئێمەش لێمان قەدەغە کراوە کە خۆمان بچوێنین بەوان لە عادەت و هەڵس و کەوتدا چ جای لە عیبادەتدا، وە پێغەمبەریش ﷺ لەعنەتی لێ کردن بە هۆی ئەم کارانەیانەوە).

وە هەروەها دەڵێت: (هەر کەسێك مزگەوتێك دروست بکات لە نزیك قەبری پێغەمبەرێك یان پیاو چاکێك بەشێوەیەك کە قەبرەکە بکەوێتە ناو مزگەوتەکەوە، وە ئەم کارەش بە ئومێدی بەرەکەتی ئەو بێت لە عیبادەتداو نزیك بوون بێت لە ڕۆح و گیانی ئەو مردووە، ئەوا بەڕاستی ئەم فەرمودەیە دەیگرێتەوە زۆر بە ڕوون و ئاشکرایی وەك ڕۆژی ڕووناك، وە هەر کەسێکیش ڕوو لەو بکات لە نوێژداو ملکەچی بۆ بنوێنێت و ئومێدی پێی هەبێت، ئەوا هیچ گومانی تێدا نیە کە ئەو کەسە هاوەڵ و شەریکی بۆ خوا داناوەو پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەری ﷺ کردووە) [3].

---

(١) بە کورت کراوەیی وەرگیراوە لە کتێبی (إغاثة اللهفان) (١٤٣/١-١٥٤).

(٢) شرح النووي على مسلم (٥/١٣/٤).

(٣) الفتح الرباني (٣/٧٥).

# زیادەڕەوی لە دینەکەتاندا مەکەن

# لاتغلو في دينكم

هۆکارێکی تر لەو هۆکارانەی کە سەر دەکێشێت بۆ بت پەرستی و زیادەڕەوی کردن، زیادە ڕەوی کردنە لە پێغەمبەان و فریشتەکان و پیاو چاکان و جگە لەوانیش لە بەندە بەڕێزەکانی خوای گەورە.

وە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا هەواڵی پێداوین دەربارەی ئەو زیادە ڕەویەی کە جولەکەو گاورو موشریکەکان کردویانە لە بەرامبەر هەندێ لە دروستکراوەکانیدا، کە عیبادەتیان بۆ دەکردن جگە لە خوای گەورەو لێیان دەپاڕانەوەو ئومێدو هیوایان پێ هەبوون و خۆشیان دەویستن وەك خۆشویستنی خوای گەورە، وە لەم ئایەتە پیرۆزانەش:

١.خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾[1]، واتە: (بەڕاستی ئەوانە کافر بوون کە دەیان وت: مەسیحی کوڕی مەریەم خوایە! بڵێ ئەی محمد ﷺ کێ لای خوای گەورە شتێکی بە دەستە کاتێك خوای گەورە ویستی کە مەسیحی کوڕی مەریەم و دایکی و هەموو ئەوەش کە لە زەوی دایە بە هیلاك ببات؟ وە موڵکی ئاسمانەکان و زەوی و هەموو ئەوانەی کە تیایدان هی خوای گەورەیە بە تەنها، وە با ئەوەشیان بەلاوە سەیر نەبێت کە خوای گەورە عیسای بەبێ باوك دروست کردووە، چونکە خوای گەورە چی بوێت و چۆنی بوێت دروست دەکات، کە بیەوێت مرۆڤ لە دایك و باوك دروست دەکات وەك هەموو بەرەی ئادەمیزاد، وە کە بیەوێت لە باوك بە بێ دایك وەك

---

(١) سورة المائدة: (١٧).

حەوا، وە کە بیەوێت لە دایك بە بێ باوك وەك عیسا، وە کە بیەوێت بە بێ دایك و باوك وەك ئادەم، وە خوای گەورە دەسەڵات و توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە).

٢. وە هەروەها دەفەرموێت:﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾[1]، واتە: (بەڕاستی ئەوانە کافر بوون کە دەیان وت: مەسیحی کوڕی مەریەم خوایە! وە مەسیح دەی وت: ئەی بەنی ئیسرائیل تەنها ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەیە، بەڕاستی هەر کەسێك شەریك و هاوەڵ بۆ خوای گەورە دابنێت، ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات و مەئواو شوێنی ئەو کەسەش ناو ئاگری دۆزەخە، وە کەسی زاڵم و ستەمکارو موشریك هیچ سەرخەرێکی نیە).

٣. وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾[2]، واتە: (بەڕاستی کافر بوون ئەوانەی کە دەیان وت: سێ خوا هەن (الله، و عیسی، و مریم)، پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی کە ئەو موشریکانە دەیڵێن، وە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە (الله)، وە ئەگەر واز نەهێنن لەو شتانەی کە دەیڵێن، ئەوا بەڕاستی ئەوانەی کافر بوون توشی سزاو عەزابێکی زۆر توندو

---

(١) سورة المائدة: (٧٢).

(٢) سورة المائدة: (٧٣ - ٧٥).

بە ئێش دەبن، پاشان خوای گەورە بانگیان دەکات بۆ تەوبە کردن و دەفەرموێت: ئایا ناگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورەو پەرستنی ئەو بە تەنهایی؟ وە ئایا داوای لێ خۆش بوون ناکەن لەو قسانەی کە دەتانکردن؟ بەڕاستی خوای گەورە زۆر بە بەزەیی و لێ خۆش بووە، وە عیسا سەلامی خوای لێ بێت تەنها پێغەمبەرێکە کە خوای گەورە ناردوویەتی و لە پێش ئەویشدا پێغەمبەرانێکی زۆر هاتوون، وە دایکیشی ئافرەتێکی تەواو ڕاستگۆیە کە ئەوەش پلەو پایەیەکی زۆر بەرزە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە، کەوایە مادام هەردوکیان مرۆڤن ئەی چۆن دەیان کەن بە دوو خوا لەگەڵ خوای گەورەو پاك و تاك و تەنها؟ وە ئەوان خواردن دەخۆن کە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە ئەوان دوو بەندەی لاوازی خوای گەورەن و وەك هەموو بەندەکانی تر پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە هەیە، سەیرکە چۆن حەق و بەڵگەکانی خۆمانیان بۆ ڕوون دەکەینەوە کەچی ئەوان هەر سەرکەشی دەنوێنن و واز ناهێنن لەو درۆو بوهتانەی کە باسی دەکەن).

٤. وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ۝ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾[1]،

واتە: (جولەکەکان دەیان وت: (عوزەیر) کوڕی خوایە، وە گاورەکانیش دەیان وت: (عیسا) کوڕی خوایە، وە ئەمەش تەنها قسەیەکەو هیچ بەڵگەیەکیان پێ نیە لەسەری، ئەمەش هەروەك قسەی موشریکە کۆنەکان وایە کە دەیان وت: فریشتەکان کچی خوان، خوای گەورە بیان کوژێت و لەناویان بەرێت لەسەر ئەو درۆو بوهتانەی کە دەیکەن،

(١) سورة التوبة: (٣٠ - ٣١).

زانـاو عابیـدەکانیان دەکـردن بـە خـواو زیادەڕەویـەکی زۆریـان تیـادا دەکـردن، وە حەرامیان بۆ حەڵاڵ ئەکردن و حـەڵاڵیان لـێ حـەرام ئـەکردن وە ئـەوانیش گوێڕایـەڵیان ئەکردن، ئەمەش هاوبەش بۆ خوا دانانە لە گوێڕایەڵی کردن لە ناشەرعیدا، وە هەروەها بە هەمان شێوە زیادەڕەویەکی زۆریان لە مەسیحی کوڕی مەریەمیشدا دەکرد، وە هـیچ فەرمانێکیان پێ نەکرابوو تـەنها ئـەوە نـەبێت کـە بـەتها خـوای گـەورە بپەرسـتن، ئـەو خوایەی کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لەو، پـاکو بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایـەی لەوەی کە موشریکەکان دەیکەن).

٥. وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا﴾[1]، واتـە: (ئـەی ئـەهلی کیتـاب (جولەکـەو گاورەکـان) زیـادەڕەوی لـە دینەکەتاندا مەکەن، وە هیچ شـتێك لەسـەر خـوای گـەورە مـەڵێن تـەنها حـەق نـەبێت، بەڕاستی عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لێ بێـت نێـردراوی خوایـەو وە کەلیمـەی خوایە کە بۆ مەریەمی ناردووەو لەو ڕۆحانەیە کە خوای گەورە خـۆی دروسـتی کـردووە بە تەواوترین شێوە، بۆیە ئیمان بهێنن بە خواو بە پێغەمبـەرەکەی، وە مەڵێن سێ خـوا هەنە، وە ئەگەر وازبهێنن لەمە ئەوە بۆ ئێوە باشترو خێرتـرە، بەڕاسـتی خـوای گـەورە پەرسـتراوی تـاك و تەنهایـەو پـاك و بێگـەردەو دوورە لـەوەی کـە منـداڵی هـەبێت، وە ئەوەی کە لە زەوی و ئاسمانەکان دایە هەمووی موڵکی خوایە).

---

(١) سورة النساء: (١٧١).

٦. وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾[1]، واتە: (ئەی ئەهلی کیتـاب (جولەکـەو گاورەکـان) زیـادەڕەوی لـە دینەکەتانـدا مەکـەن و تـەنها شـوێن حـەق بکـەون، وە شـوێن هـەواو ئـارەزوی ئەوانـە مەکەون کە لە پێشودا گومڕابوون، وە خەڵکانێکی زۆریان گومڕا کـردو لاڕێیـان کـردن و لە ڕێگای ڕاست لایان دان).

ابن کثیر ڕەحمەتی خوای لیّ بێت دەڵێت: (خوای گەورە نەهی دەکات لە ئەهلی کیتـاب (جولەکەو گاورەکان) لە زیادەڕەوی کردن، وە ئـەوەش لـەناو گاورەکانـدا زۆر زیـاترە، وە ئەوان لەو پلـەو پایەیـەی کـە عیـسی سـەلامی خـوای لـیّ بێـت بـۆی دانرابـوو زیـاتر زیادەڕەویان کرد، تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە لـەو ڕادەیـە زیـاتر بـەرزیان کـردەوە کـە خوای گەورە پێی بەخشیبوو، وە لە پلەی پێغەمبەرایەتی گواستیانەوە بۆ ئەو ئاستەی کە کردیان بە پەرستراوو جگە لە خـوای گـەورە پەرسـتنیان بـۆ دەکـرد هـەروەك چـۆن پەرستنیان بۆ خوای گەورە دەکرد، وە هەروەها زیادەڕەویان کرد لە شوێن کـەوتوان و ئەوانەی کە لەسەر دینەکەی بوون، وە بە مەعصوم و پارێزراویـان دەزانـین و شـوێنیان دەکەوتن لە هەموو ئەو قسانەی کە دەیان وتن، جا ئەو قسانە حەق و ڕاست بونایە یان باطل و نادروست، یان گومڕایی بونایە یان ڕێنمایی و ڕێ نیشاندەر، یـان ڕاسـت بونایـە یان درۆ، وە هەر بۆیە خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: (اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله)[2].

وە هەروەها ابن جریر ڕەحمەتی خوای لیّ بێت دەڵێت: (لاتغلـوا في دیـنکم) واتـە: (لـە دینەکەتانـدا زیـادەڕەوی مەکـەن و لـە حـەق لامـەدەن، وە دەربـارەی عیـسی سـەلامی

---

(١) سورة المائدة: (٧٧).

(٢) تفسير ابن كثير (٢/٤٣٠).

خوای لێ بێت جگە لەوەی کە حەقە هیچی تر مەڵێن، لەبەر ئەوەی ئەوەی کە دەیڵێن کە گوایە عیسی سەلامی خوای لێ بێت کوڕی خوایە، ئەوە قسەیەکە لە ئێوەوەیە دەربارەی خوای گەورەو حەق نیە، چونکە خوای گەورە هیچ منالّی بۆ خۆی دانەناوە، وە عیسی سەلامی خوای لێ بێت و جگە لەویش منالّ و کوڕی دروست کراوەکانی خوای گەورەن)[1].

بە هۆی هەموو ئەو زیادەڕەوی و تێپەڕاندنەی کە گاورەکان کردیان دەرهەق بە عیسی سەلامی خوای لێ بێت کە پێی گەیشتنە ئاستی کافر بوون و کردیان بە پەرستراوو پەرستنیان بۆ ئەنجام دەدا، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ وورياييەكی زۆری پێداوین دەربارەی زیادەڕەوی کردن و تێپەڕاندن لەسەر کەسایەتی پێغەمبەرمان ﷺ، بۆ ئەوەی ئێمەش نەکەوینە ناو ئەو گومڕاییەی کە گاورەکانی تێکەوتن، وە لە زۆر فەرمودەدا پێغەمبەر ﷺ ئاماژە بەوە دەکات، لەوانەش:

١. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (زیادەڕەوی لە مندا مەکەن هەروەك گاورەکان زیادەڕەویان کرد لە کوڕی مەریەمدا، بەڵکو من عەبدو بەندەی خوام، ئێوەش بڵێن عەبدو نێردراوی خوایە)[2].

٢. وە هەروەها دەفەرموێت: (ووریابن و خۆتان بپارێزن لە زیادەڕەوی کردن لە دیندا، چونکە بەڕاستی ئەوانەی پێش ئێوە بە هیلاك چوون بەهۆی زیادەڕەوی کردن لە دیندا)[3].

٣. وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئینکاری کرد لە بەرامبەر ئەو کەسەدا کە پێی ووت: (ماشاء الله وشئت)، ئەویش پێی ووت: (ئایا منت کرد بە شەریکی خوای گەورە؟ بەڵکو بڵێ: (ماشاءالله وحده)[1].

---

(١) تفسير ابن جرير (٩/١٧٠-١٧١).

(٢) صحيح: أخرجه البخاري (٦/٤٧٨) من حديث عمر بن الخطاب رضي الله عنه.

(٣) صحيح: رواه أحمد (١/٢١٥)، والنسائي (٥/٢٦٨)، وابن خزيمة (٤/٢٧٤)، وصححه إمامنا الالباني (رحمه الله) في (السلسلة الصحيحة) (٢١٤٤).

٤. وە هەروەها پێی ناخۆش بووە کە هاوەڵانی لەبەری هەستن، هەروەك ئەنەس ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (هیچ کەسێك لای هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت لە پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستتر نەبوو، کەچی کاتێکیش دەیان بینی هەڵنەدەستان لەبەری کاتێك کە زانیان حەزی لەوە نیە)[٢].

٥. وە هەروەها پێی ناخۆش بوو کاتێك هاوەڵان پێیان دەوت: (أنت سيدنا)، ئەویش دەیفەرموو: (السيد الله تبارك وتعالى)، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە فەرمودەی شەفاعەتدا هەواڵی داوە کەوا گەورەی نەوەکانی ئادەمە، بەلام بۆ ڕێگرتن لە زیادەڕەوی لەسەری، بە بەڵگەی ئەوەی کە فەرمویەتی: (أيها الناس قولوا بقولكم أو بعض قولكم ولا يستجرينكم الشيطان)[٣].

---

(١) صحيح: رواه أحمد (ح١٨٣٩)، وصححه إمامنا الالباني (رحمه الله) في (السلسلة الصحيحة) (٢٦٦).

(٢) صحيح: رواه الترمذي (٥/٩٠) وصححه إمامنا الالباني (رحمه الله) في (مشكاة المصابيح) (٤٦٩٨).

(٣) صحيح: رواه أبو داود(٥/١٥٤)،وصححه إمامنا الالباني(رحمه الله)في(صحيح سنن ابي داود) (٤٨٠٦)

# بەندی دووەم:

# بانگەوازی کردن بۆ هاوبەش بۆ خوا دانان

**بەشی یەکەم:**

**هاوبەش بۆ خوا دانان لە عیبادەتدا.**

**بەشی دووەم:**

**هاوبەش بۆ خوا دانان لە پەروەردگارێتیدا.**

**بەشی سێیەم:**

**هاوبەش بۆ خوا دانان لە ناوو سیفەتە جوانەکانیدا.**

وەك پێشتر باسمان کرد کە ئـایینی ئیـسلام بریتیـە لـە بـە تـەنها زانینـی خـوای گەورە لە پەرستن و ملکەچی بۆ نواندندا، وە هەموو پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێت بـۆ ئـەوە نێـردراون کـە بانگـەوازی بکـەن بـۆ بـە تـەنها پـەرستنی خـوای گـەورەو سڕینەوەو لابردنی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان لەناو ئوممەتەکانیاندا.

وە هەروەها بە تەنها زانینی خوای گەورە لە ڕووی پەروەردگارێتیەوە، بریتیە لە داننان بەوەی کە تەنها خوای گەورە دروستکارو ڕۆزی دەرەو ئاسمانەکان و زەوی و ئـەوەیش کە تیایاندایە هەر هەمووی بە دەستی خوای پەروەردگارە، وە وتمـان موشـریکەکانیش بڕوایان وابوو، بەڵام گومانی تێدانیە کە بە بڕوا بوون بە پـەروەردگارێتی خـوای گـەورە بە تەنها مرۆڤـ نایەتە ناو بازنەی ئیسلامەوە.

وە باسمان کرد کە سەرەتای سەرهەڵدانی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانـان دەگەڕێتـەوە بۆ سەردەمی قەومی نوح کە زیادەڕەوی زۆریان کرد لە پیاو چاکانداو لـە پلـەو پایـەی خۆیـان زیـاتر بـەرزیان کردنـەوەو لەگـەڵ خـوای گـەورە دەیـان پەرسـتن، کـە ئەمـەش بەرهەمی زیادەڕەوی و تێپەڕاندن بوو لە پلەوپایەی بەندەکان.

وە ئەم زیادەڕەوی و پەرستنەش تەنها لە پیاو چاکان و پێغەمبـەران و فریـشتەکان و ئەو پەیکەرانەدا نەبوو کە دەیان پەرسـتن، بـەڵکو زۆر شـتی تریـشیان دەپەرسـت وەك دارو بەردو ئەنجامدانی پەرستن لەو شوێنانەی کەوا ئەو پێغەمبەرو پیاو چـاکانە پیایـدا ڕۆیشتوون یان لێی ماونەوە.

وە ئەم پیاوەش (محمد بن علوي المالكي) یەکێکـە لەوانـەی کـە بـە تـەواوی پێـچەوانەی ئەو فەرمانانەیە کە بە هۆیانەوە بە تەنها زانینی خوای پەروەردگار لە ڕووی پـەرستن و پـەروەردگارێتی و ......هتـد بـە دەسـت دەهێنـرێن، وە هـەموو قـسەو هەڵوێستەکانی هەڵوەشێنەرەوەی ئەم بە تەنها زانینەی خوای پەروەردگارە لە هەموو ڕوویەکەوە.

وە گومانی تێدا نیە كە ئەم پیاوە هاوشـێوەو هاوونێنـەی زۆرن كـە دوورن لـە بـە تـەنها دانان و زانینی خوای گەورەدا، وە بڕوایان بـە عیبـادەت كـردن بـۆ غـەیری خـوا هەیـەو بەخۆیشیان نەزانیوە كەوتونەتە ناو شیرك و كوفرو هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە.

بۆیە لێرەدا ئامـاژە بـە بەشـێك لـەو قسەو بابـەت و هەڵوێستانە دەكـەین كـە نـاوبراو ئاماژەی پێداون و پێچەوانەن لەگـەڵ بنـچینەكانی بـە تـەنها زانـینی خـوای گـەورە، وە پشت بە خوای گەورە لە وەڵامی شـوبهەو گومـان و سـەر لـێ شـێواویەكانیدا پـشت بـە ئایـەت و فـەرمودەی صـەحیحی پێغەمبـەر ﷺ و فـەتوای ڕاسـت و دروسـتی زانایـان دەبەستین.

# چەند نمونەیەك لە وتەکانی ئەم پیاوە لە شیرکی عیبادەتدا

١. ئەم پیاوە دەڵێت: (هیچ شەفاعەتکارێك نیە ئەی پێغەمبەری خوا جگە لە تۆ کە هیوامان پێ بێت، وە هیچ ئومێدێك نیە جگە لە دەرگای تۆ کە بمان گەیەنێت)[1].

٢. وە هەروەها دەربارەی سەردان کردنی گۆڕی پیاو چاکان دەڵێت: (وە ئەگەر هاتی بۆ لایان ئەوا خۆت زەلیل و مل کەچ و فەقیرو موحتاج بکەو با دڵ و خەیاڵت لایان بێت، بە چاوی دڵ نەك بە چاوی بینین)، تا ئەو شوێنەی کە دەڵێت: (وە دروستە داوای بە فریاکەوتنیان لێ بکەیت و پێداویستیەکانی خۆتی لێ داوا بکەیت)[2].

٣. پاشان دەڵێت: (وە سەردان کردنی گەورەی سەرەتاو کۆتاییەکان سەلات و سەلامی خوای لێ بێت، هەموو ئەوانەی کە باسکران چەندانە دەبنەوە، مەبەستم خۆ شکاندنەوەو مل کەچی نواندن و دەربڕینی بێ دەسەلاتی، چونکە شەفاعەتکارو شەفاعەت لێکراوێکی وایە کە شەفاعەتەکەی ڕەت ناکرێتەوە، وە هەر کەسێکیش مەبەست و ئومێدی بەو بێت ئەوا زەرەرمەند نابێت، وە ئەوەش کە بچێتە لای و داوای کۆمەك ویارمەتی و بەفریا کەوتنی لێ بکات)[3].

٤. وە هەروەها چەند شعرێکیشی هێناوە لەوانە:

انت الشـفيع وآمـالي معلقة          وقد رجوتك ياذا الفضل تشفع لي
هذا نزيلك أضحى لا ملاذ له          إلا جنابك يا سؤلي ويا أمـلي[4]

٥. وە هەروەها دەڵێت:

فلذ به من كل ما تشتكي          فهو شفيع دائما يقبل
ولذ به في كـل مـا ترتجي          فـإنه المأمن والمعقل

---

(١) شفاء الفؤاد (ص٣٦).

(٢) شفاء الفؤاد (٩٢).

(٣) الذخائر (ص١٠١)؛ وشفاء الفؤاد (ص١٠٩).

(٤) شفاء الفؤاد (ص٩٧).

وحط أحمال الرجى عنده فـإنه المـرجع والمـوئل
و نـاده إن أزمـة أنشبت أظفارها واستحكم المعضل
يا أكـرم الخلق على ربـه وخير من فيهم به سأل
قد مسني الكرب وكم مرة فرجت كربا بعضه يذهل
عجل بإذهاب ألذي اشتكي فإن توقفت فمن ذا أسأل؟

پاشان ئەم پیـاوە دەڵێـت: (ئـەوە تـاقى كراوەتـەوە بـۆ داواكـردن و دابـین كردنـى پێداویستیەكان كە لە كۆتایی شەودا بخوێنرێت.. وە ئەو دێرەش (عجل بإذهاب ألـذي اشتكي) (٧٣) جار دووبارە بكرێتەوە)[1].

٦. وە هەروەها دەڵێت:

يـا مـــلاذ الـورى وخـــير عيـان ورجاء لكل دان وقصى
لك وجهي وجهت يا أبيض الوجه فوجه الـيه وجه الولي[2]

٧. وە دەڵێت:

فالآن ليس سوى قبر حللت به منجي الطريد ومنجا كل معتصم
وإن رمتنا الخطايا وسط مهلكة فأنت ملجأ خلق الله كلهم
فالعفو شيمتك العظمى التي شهرت إذ كانت الموبقات الدهم من شيمي[3]

٨. وە هەروەها دەڵێت:

يا سيدي يا رسول الله خذ بيدي مـالي سواك ولا ألوي علـى أحد
إنـي إذا سـامني ضـيم يروعـني أقـول يا سيد السادات يا سندي

(١) الذخائر (ص ١٥٨).
(٢) الذخائر (ص١٦٦).
(٣) شفاء الفؤاد (ص١١٤).

وانظر بعين الرضا لي دائما أبداً واستر بفضلك تقصيري مدى الأمد
واعطف علي بعفو منك يشملني فـإني عنك يا مـولاي لـم أحـد[1]

٩. وە دەڵێت:

يا سيدي إنـي رجوتك ناصـراً من جور الدهر خائن متقلب
فأقل عثار عبيدك الداعي الذي يرجوك إذ راجيك غير مخيب
واكـتب له ولوالـديه بـراءة من حـر نـار جهنم المتهـلب
واقمع بحولك باغضيه وكل من يؤذيـه مـن متمـرد متعصـب
واشفع لـه ولمن يليه وقم بهم في كل حال يا شفيع المذنب[2]

١٠. وە هەروەها دەڵێت:

ألا يارسول الله عطفاً ورحمةً لمسـترحم مسـتنظـر للـمبارر
ألا يا حبيب الله غوثاً وغارة لـذي كربة مسـودة كالدياجر
ألا يا صفي الله قم بي فـإنني بكم واليكم يا شريف العناصر[3]

دەڵێم: ئەوەی كە تۆ بینیت و خوێندتەوەو لێرەدا هێنراوەتەوە، ئـەوە دڵۆپەیەكـە لە دەریایەكی گەورە، وە بینیت كە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان و كوفری ئاشـكرای تێدایە، بەشێوەیەك كە هیچ شتێكی لە پەرستندا بۆ خوای گـەورە نەهێـشتۆتەوە، وەك پاڕانەوەو ئومێد پێ بوون و داوای كۆمەك و یارمەتی كردن و بەفریا كەوتن و......هتد، وە هـەموو ئـەو شـتانەش كـە موشـریكەكانی سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ بتـەكانیان ئەنجامیان دەدا كە دروست نیـە هـیچ شـتێك لەوانـە بـۆ غـەیری خـوای گـەورە ئـەنجام بدرێت.

---

(١) شفاء الفؤاد (ص٢٠٣).

(٢) شفاء الفؤاد (ص٢١٣).

(٣) شفاء الفؤاد (٢٢٢-٢٢٣).

وە گومانی تێدا نیە کە بەم کارەش بنچینەو ئەصڵی ئیمان و حەقیقەتی ئیسلام هەڵدەوەشێتەوە، کە بنچینەکەی لەسەر بە تەنها پەرستنی خوای گەورە وەستاوە لە هەموو ڕوویەکەوە، وە هەروەها وازهێنان و دوورکەوتنەوە لە هاوبەش دانان بۆی لە هەموو بوارەکانی پەرستندا، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ وَإِن يَمْسَسْكَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَآدَّ لِفَضْلِهِۦ ﴾[1]، واتە: (جگە لە خوای گەورە هاوار مەکە هیچ کەسێك کە نە قازنجت پێ دەگەیەنێت و نەزەرەریشت لەسەر لادەبات، وە ئەگەر ئەم کارەت کرد ئەوا بەڕاستی ئەو کاتە تۆ لە ستەمکارو موشریك و هاوەڵ پەیداکەرانی، وە ئەگەر خوای گەورە بیەوێت توشی زەرەرێکت بکات ئەوا هیچ کەسێك ناتوانێت لەسەرت لاببات تەنها ئەو نەبێت، وە ئەگەر بشیەوێت کە خێرێکت توش بکات ئەوا هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگر بێت لە بەردەم فەزڵ و بەخششی خوای گەورەدا).

وە پوختەی قسەی ڕاڤەکارانی قورئانیش ئەوەیە کە خوای گەورە نەهی کردووە لە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە هاوار بکاتە غەیری خوای گەورە لە کاتێکدا هیچ سودو قازانجێکیان بە دەست نیە، وە مەبەستیش لەوە ئەوەیە کە هەموو شتێك جگە لە خوای گەورە نە سودیان بە دەستە نە زەرەر، وە لەوەشدا پێغەمبەران و پیاو چاکان و جگە لەوانیش هەموویان چۆن یەك و وەك یەك وان، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴾[2] ، واتە: (بەڕاستی مزگەوتەکان هی خوای گەورەنە، بۆیە لەگەڵ خوای گەورەدا هاوار مەکەنە هیچ شتێکی تر).

وە هەروەها پێغەمبەریش ﷺ بە (ابن عباس)ی فەرموو: (ئەگەر داوای شتێکت کرد ئەوا داوا لە خوا بکە، وە ئەگەر داوای یارمەتیشت کرد ئەوا هەر داوا لە خوا بکە، وە

---

(١) سورة يونس: (١٠٦ - ١٠٧).

(٢) سورة الجن: (١٨).

بزانە کە ئەگەر هەموو ئوممەت کۆببنەوە لەسەر ئەوەی کە سودێکت پێ بگەیەنن ئەوە هیچ سودێکت پێ ناگەیەنن تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە بۆی نوسیویت، وە ئەگەر کۆشببنەوە لەسەر ئەوەی کە زەرەرێکت لێ بدەن ئەوا ناتوانن تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە لەسەری نوسیویت)[١].

وە ئەو ئایەتە ئەوەی تێدا بەدی دەکرێت کە دەبێت ئەو کەسەی هاواری دەکرێتێ خاوەنی سودو قازانج بێت و بەدەستی بێت، بۆ ئەوەی هەر کەسێك هاواری کردێ و داوای شتێکی لێ کرد پێی ببەخشێت یان هەر کەسێك سەرپێچی کرد پێی نەبەخشێت، وە ئەوەش بۆ هیچ کەسێك نیە تەنها بۆ خوای گەورە نەبێت، وە لەوەوە بۆمان دەرکەوت کە ئەو کەسەی هاواری دەکرێتێ و پشتی پێ دەبەسترێت تەنها خوای گەورەیەو بەس، وەك دەفەرموێت: ﴿ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ کەواتە هەر کەسێك هاوار بکاتە غەیری خوای گەورە ئەوکاتە لەگەڵ موشریکەکان لە قەڵەم دەدرێت.

وە ئەمەش وەك ئەم ئایەتە وایە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴾[٢]، واتە: (لەگەڵ خوای گەورە هاوار مەکە هیچ پەرستراوێکی تر، چونکە ئەگەر ئەوە بکەیت ئەوا ئەو کاتە لەو کەسانە دەبیت کە سزاو عەزاب دەدرێن)، وە ئەو ئایەتەش کە دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾[٣]، واتە: (بەڕاستی ئەی پێغەمبەر بە وەحی بۆ تۆ هاتووە وە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش، کە ئەگەر هاوەڵ بۆ خوا دابنێیت ئەوا بەڕاستی هەموو کردەوەکانت هەڵ دەوەشێنەوەو لەو کەسانە دەبیت

---

(١) صحيح: رواه الترمذي (٤/٦٦٧)، وصححه إمامنا الألباني (رحمه الله) في (صحيح الجامع) (٧٩٥٧).

(٢) سورة الشعراء:( ٢١٣).

(٣) سورة الزمر:(٦٥).

کە خەسارەت مەندو زەرەرمەندن)، وە هەروەها ئەو ئایەتەش کە دەربارەی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾[1]، واتە: (ئەگەر هاوەڵ و شەریك بۆ خوا دابنێن ئەوا هەموو ئەو کردەوانەی کە کردویانن هەڵ دەوشێنەوە).

وە خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئانە پیرۆزەکەیدا ڕوونی کردۆتەوە کە تەنها خۆی سودو قازانج و زەرەری بە دەستەو جگە لە خۆی بە دەستی هیچ کەسێکی تر نیە، تەنانەت هەتا پێغەمبەریش ﷺ کە باشترین دروستکراوو بەڕێزترین و گەورەترین کەسە، کەچی لە هەمان کاتدا سودو قازانجی بۆ نەفسی خۆیشی بە دەست نیە چ جای ئەوەی کە سودو قازانج بە کەسانی دی بگەیەنێت و زەرەریان لەسەر لاببات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾[2]، واتە: (بڵێ ئەی محمد: بەڕاستی من هیچ قازانج و زەرەرێکم بۆ نەفسی خۆم بەدەست نیە تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە دەیەوێت، وە ئەگەر من غەیبم زانیبایە ئەوا خێرم بۆ خۆم زیاد دەکردو بەڵاو شەڕیشم لە خۆم دوور دەخستەوە، بەڕاستی من تەنها وریاکەرەوەو مژدەدەرم بۆ ئیمانداران)، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي ضَرّٗا وَلَا نَفۡعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ﴾[3].

کەواتە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ سودو قازانج و زەرەری بۆ نەفسی خۆی بە دەست نەبێت، ئەی چۆن هیچی بە دەست دەبێت بۆ غەیری خۆی لە خەڵکی؟ لەگەڵ ڕوونی و ڕۆشنی ئەوەشدا، زۆر بە ڕاشکاوی خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا

---

(١) سورة الأنعام:(٨٨).

(٢) سورة الأعراف: (١٨٨).

(٣) سورة يونس: (٤٩).

رَشَدًا ﴾[1]، واتـە: (بڵـێ: مـن هـیچ زەرەرو قـازانجێكم بـۆ ئێـوە بـە دەسـت نیـە)، وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ بـەو پـەڕی ڕاشـكاوی بـە نـزیكترین كەسـوكارو خۆشەویستانی خۆی فەرموو: (ئەی بەنی عبد مناف من هیچ سودێكتان پێ ناگەیەنم لە لای خوا، ئـەی عەباسـی كـوڕی عبـدالمطلب مـن هـیچ سـودێكت پـێ ناگەیـەنم لـە لای خـوا، وە ئـەی صەفیەی پوری پێغەمبەر من هیچ سودێكت پێ ناگەیەنم لە لای خوا، وە ئەی فاطمـەی كچی محمد، چی ئارەزوو دەكەیت لە ماڵەكەم داوا بكە من هیچ سـودێكت پـێ ناگەیـەنم لە لای خوا)[2]، ئەی باشە لە دوای ئەمە بە چ فەرمودەیەك بڕوا دەهێنن؟!!

وە هەروەها خوای گەورە فەرمانی بە بەندەكانی كردووە كە بە تەنهای دابنێن لە پشت پێ بەستن و پاڕانەوەو داوا لێ كردندا، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ هُوَ ٱلْحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾[3] واتـە: (ئـەو خوایەی كە بەردەوام زیندووەو هـیچ پەرسـتراوێكی بـە حـەق نیـە جگـە لـەو، بۆیـە بـە تەنهاو بە ئیخلاسەوە لێی بپاڕێوە، وە سوپاس و ستایش هەر شایستەی پەروەردگاری جیهانیانە).

وە هەروەها دەربارەی پێشەوای بە تەنها خوا پەرستان ابراهیم سەلامی خوای لێ بێـت دەفـەرموێت: ﴿ إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴾[4]، واتـە: (بەڕاسـتی مـن ڕووی خـۆمم كردۆتـە ئـەو كەسـەی كـە دروستكاری ئاسمانەكان و زەویەو هیچ هـاوەڵ و شـەریكێكی نیـە، وە بۆیـە منـیش لـە موشریك و هاوبەش دانەران نیم).

(١) سورة الجن: (٢١).

(٢) صحيح: متفق عليه. اللؤلؤ والمرجان (١/٥٢).

(٣) سورة غافر: (٦٥).

(٤) سورة الأنعام: (٧٩).

وە پێغەمبەریش ﷺ لە نوێژەکانیدا دەیفەرموو: (وجهت وجهي للذي فطر السموات والأرض حنيفاً وما أنا من المشركين)[1].

بەڵام ئەم پیاوە (محمد بن علوي المالكي) هەموو ئەمانە هەڵدەوەشێنێتەوەو دەڵێت:

لك وجهي وجهت يا أبيض الوجه فوجه اليه وجه الوالي

وە ئەوەش کوفرەو دژایەتی کردنی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرمودە صەحیحەکانی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە ڕووی لە دروستکارو بەدیهێنەر وەرگێڕاوە بۆ دروستکراوو بەدیهێنراوێك.

وە موشریکەکانی سەردەمی کۆنیش خوایان دەپەرست و لێی دەپاڕانەوەو پەنایان پێ دەگرت، وەك خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾[2]، واتە: (هەر نیعمەتێکی کە هەتانە ئەوە لە پەروەردگارەوەیە، وە ئەگەر توشی هەر زەرەرو زیانێکیش ببن ئەوا ڕوو دەکەنە خوای گەورە بە دوعاو پاڕانەوە کردن، پاشانیش ئەگەر ئەو زەرەرو زیانەی لەسەر لابردن، ئەوا کۆمەڵێکتان هاوبەش و شەریك بۆ خوای گەورە دادەنێنەوە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلْ أَرَأَيْتَكُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ السَّاعَةُ أَغَيْرَ اللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَاءَ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴾[3]، واتە: (بەو موشریکانە بڵێ: ئایا ئەگەر هاتوو سزاو عەزابی خوای گەورە بەسەرتاندا دابەزی، یان ئەگەر قیامەت هات بەسەرتاندا، ئەوە هاوار دەکەنە غەیری خوا لە پەرستراوەکانتان یان هاوار دەکەنە خوای پەروەردگاری تاك و تەنها؟

---

(١) صحيح: رواه مسلم (٧٧١).

(٢) سورة النحل: (٥٣ - ٥٤).

(٣) سورة الأنعام: (٤٠ - ٤١).

بەڵکو لەو کاتـەدا هـاوار دەکەنـە خـوای گـەورە، چـونکە بـاش دەزانـن ئەوانـەی ئـەوان هاواریان دەکەنێ هیچ سودو قازانج و زەرەرو زیانێکیان بەدەست نیە).

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِىَ مَا كَانَ يَدْعُوٓا۟ إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ ﴾[1] ، واتە: (ئەگەر مرۆڤـ توشی نارەحەتیەك هات ئـەوا بـە مل کەچیەوە هـاوار دەکاتـە پـەروەردگاری، پاشان ئەگـەر خـوای گـەورەش بەڵاکـەی لەسەر لابرد ئەوا ئەو بەڵاو موصیبەتەی لە بیر دەچێتەوە کە پێشتر لەسەری بووەو لـە خـوای گـەورە دەپاڕایـەوە، ئنجـا شـەریك و هاوبـەش بـۆ خـوای گـەورە دادەنێـت و بەهۆیەوە خۆیشی و خەڵکیش گومڕا دەکات، تۆش ئەی محمد بەو کەسـە نەفامـە بڵـێ: کەمێك چێژو تام وەربگرە لەو کوفرەی کە هەڵتبژاردو نیعمەتەکەی خوای گـەورەت پـێ گۆڕیەوە، بەڵام بزانە کە تۆ لە داهاتوودا لە ئاگری دۆزەخ دایت).

وە ئایەت لەو بوارەدا زۆرترە لەوەی کە تەنها هەر ئەوەندە بهێنرێتەوە، بەڵام مەبەست تەنها ئەوەیە کە ئەوانیش خوایان دەپەرست و پـەنایان پـێ دەگـرت، بـۆ لابردنـی ئـەو زەرەرو نارەحەتی و بەڵایانەی کە توشیان دەهات.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە حوکمی لەسەر کـردن بـە موشـریك و کـافرو گـومڕاو چارەنوسـیانی بـۆ ئـاگر دانـا، چـونکە هاوبـەش و شـەریکیان بـۆ دادەنـاو لـەوانیش دەپاڕانەوەو داوایان لێ دەکردن لەو کاتانەی کە لە دۆخی ئاساییدا بوون.

کەچی ئەم پیاوە جگە لە خـوای گـەورە پەرسـتراوەکەی خـۆی بـە تـەنها دادەنێت لـە هەموو کاتێکدا لە پاڕانەوەو داوا لێ کردن و ..... هتد، ئەویش کاتێك کە دەڵێت:

هذا نزيلك أضحى لا ملاذ له إلا جنابك يا سؤلي ويا أملي

---

[1] سورة الزمر: (٨).

وە هەروەها دەڵێت:

فالآن ليس سوى قبر حللت به      منجي الطريد ومنجا كل معتصم

وە ئەم پیاوە بەوەشەوە نەوەستاوە بەڵکو دەیەوێت لە هەموو ڕوویەکەوە وەك موشریکەکانی سەرەتا بکات، ئەوەتا دەیەوێت عیبادەت بۆ بت و صەنەم بکات بەلاَم بە شێوازێکی تازەو زۆر سەیرتر لەو شێوازە کۆنەی کە هەبووە، بەڵێ، شتێکە کە ترسناکی و کوفرەکەی زۆر گەورەترە لە هی ئەوانەی کۆن.

چونکە بەڕاستی دەیویست بتێك دروست بکات لەسەر شێوەی پێغەمبەر ﷺ هەروەك چۆن موشریکەکان دەیان کرد بۆ گەورەکانی خۆیان، بەلاَم ئەو بێ دەسەلاَت بوو لە کێشانی وێنەو شێوەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، بۆیە بە ناچاری پەنای بردە بەر دروست کردنی نەعلەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە لەوەشیان دەستەو وەستان بوو، ئنجا شەیتان وەحی بۆ کردو فەرمانی پێ کرد کە پەنا بباتە بەر خەیاڵ و وێنەیەك بۆ نەعلەکان دروست بکات، پاش ئەوەی کە ئەم خەیاڵە بوو بە ڕاستی و وێنەی نەعلەکانی کێشا، ئنجا داوای بەفریا کەوتن و هاوکاری و کۆمەکی لێ دەکرد.

هذه صورة مثال النعل النبوي الشريف «١»



وە ئەمـە لەبـەر چـاوتەو دەبینیـت کـە بانگـەوازی کردنێکـی ئاشـکرایە بـۆ شـیرك و پەرستنی بت و پەیکەر، وە بەوەوە ناوەستێت کە دروست کراوێك بپەرسترێت و دوعـاو پاڕانەوەو داوای یارمەتی و کۆمەکی لێ بکرێت، بەڵکو پـشت بـە خـەیاڵ دەبەستێت و نەعلـەکانی پێغەمبـەر ﷺ دروسـت دەکات و بانگی خـەڵکیش دەکات بۆ پەرسـتنی، ئەمەش بۆ زیندوو کردنەوەی ڕێبازی سامری کە خوای گەورە دەربارەیان دەفـەرموێت:

﴿ فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَّهُۥ خُوَارٌ فَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمْ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِىَ ۝ أَفَلَا يَرَوْنَ أَلَّا يَرْجِعُ إِلَيْهِمْ قَوْلًا وَلَا يَمْلِكُ لَهُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ﴾[1]، واتە: (سامری لە خـشڵ و ئاڵتونـە تواوەکان پەیکەری گوێرەکەیەکی دروست کـرد خەڵکەکـەش وتیـان: ئەمـە خواکەتانـە، وە خوای موساشە کەئێستا چوەتە کێوی طورو بە دوایدا دەگـەڕێت، وە ئایـا ئەوانـەی ئەو گوێرەکەیەیان دەپەرست نەیان دەزانی کە ئەگەر پرسـیاریان لـێ کردبا ئـەوا هـیچ وەڵامێکی نەدەدانەوە؟ وە هەروەها هیچ قازانج و زەرەرێکیشی بەدەست نیە).

وە بۆمان هەیە لەم پیاوە بپرسین کە ئایا ئـەو خەیاڵـەی ئـەو هـەمان ئـەو نەعلەیە کـە پێغەمبەر ﷺ هەیبووە؟ وە ئاشکرایەو گومانی تێدا نیە کە شـتێك نـەبینرابێت هـەرگیز بە خەیاڵ ناتوانرێت هەمان شت دروست بکرێتەوە.

بەڵام واللە ئەمە هەرچیەك بێت و هەرچۆنێك بێت، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشـکرایە لەسـەر کەم عەقڵی و گومڕایی و کـەم نرخـی ئـەم پیـاوەو هاوشـێوەکانی، وە هـەروەها بەکـەم زانین و گاڵتە کردنێکی ئاشکرایە بە خەڵکی بەوەی کە شتی لەم شـێوەیەیان بـە گوێـدا دەدەن و نیشانیانی دەدەن.

---

(١) سورة طه: (٨٨ – ٨٩).

# کامیان گومڕا ترن؟!

دیارە کە موشریکە کۆنەکان هاوبەشیان بۆ خوای گەورە دادەنا لە پەرستندا، بە پاڕانەوە لە بت و پەیکەرەکان وە ئومێدو هیوایان پێ هەبوون و دەیان کردن بە وەسیلەو شەفاعەتکار بۆ لای خوای پەروەردگار، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴾[1]، واتە: (ئەوانەی کە غەیری خوای گەورەیان دەکرد بە شەفاعەتکار دەیان وت: خۆ ئێمە نایان پەرستین بەڵکو بۆ ئەوەیە کە لە خوامان نزیك بخەنەوە)، وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ﴾[2]، واتە: (وە پەرستن و عیبادەت بۆ غەیری خوای گەورە ئەنجام دەدەن کە نە زەرەریان لەسەر لادەبات و نە سودێکیشیان پێ دەبەخشێت، وە دەڵێن: ئەوانە شەفاعەتمان بۆ دەکەن لای خوا).

بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئەوان بە بەردەوامی ڕانەهاتبون لەسەر ئەم حاڵە، بەڵکو هەندێك جار پاڕانەوەو ئومێدی تەواویان بە خوای گەورە هەبوو لە هەندێ بواردا:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا رَكِبُواْ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴾[3]، واتە: (ئەگەر ئەو موشریکانە سواری بەلەم دەبوون و دەریاکە شەپۆلی دەکرد، بە ئیخلاسەوە هاواریان دەکردە خوای گەورەو کاتێکیش خوای گەورە ڕزگاری دەکردن و دەیگەیاندنەوە وشکانی، لەو کاتەدا هاوبەش و شەریکیان بۆ خوای گەورە دادەنایەوە).

---

(١) سورة الزمر:(٣).

(٢) سورة يونس: (١٨).

(٣) سورة العنكبوت: (٦٥).

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿ قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴾[1]، واتە: (بە موشـریکەکان بڵـێ: کـێ ڕزگارتـان دەکـات لـە ناڕەحەتیـەکانی وشکانی و ناو ئاودا کاتێك توشتان دەبێت؟ وە لەو کاتەدا هاوار دەکەنـە خـوای گـەورە بە دڵێکی زەلیل و مل کەچەوەو دەڵێن: ئەگـەر لـەو ناڕەحەتیـە ڕزگارمـان بکـات ئـەوا بەڕاستی ئێمە لە سوپاس گوزاران دەبـین، بڵـێ: خـوای گـەورە ڕزگارتـان دەکـات لـە هەموو ئەمانە، بەڵام کاتێك ڕزگارتان بوو ئێوە سەر لە نوێ هاوەڵ و شـەریك بـۆ خـوای گەورە دادەنێنەوە).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ فَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٖ كَفُورٖ ﴾[2]، واتـــە: (وە کاتێك شەپۆلی دەریا وەك گەواڵەو هەورێکی تاریك دایدەپۆشین، ئەوا بە تەنهاو بە ئیخلاسەوە هاواریان دەکردە خـوای گـەورەو لێـی دەپاڕانـەوە تـا ڕزگاریـان بکـات، وە کـاتێکیش ڕزگارمـان کـردن و گەیاندمانـە وشـکانی، ئـەوا بـوون بـە دوو کۆمەڵـەوەو کۆمەڵێکیان وەك پێویست هەڵنەستان بە شوکر کردنی خـوای گـەورەو سـوپاس گـوزار نەبوون لەسەر نیعمەتەکانی، وە کۆمەڵێکیشیان کافر بوون و ئینکاری نیعمـەتی خـوای گەورەیان دەکرد، وە هـیچ کەسـێکیش ئینکـاری نیعمـەتی خـوای گـەورە ناکـات تـەنها کەسێك نەبێت کە کافرەو هەست بە نیعمەتەکانی خوای گەورە ناکات).

وە ئەمە حاڵی موشریکە کۆنەکان بوو لە عیبادەت کردونیان بۆ بت و پەرسـتراوەکانیان کە لە کاتی ئاساییدا لەگەڵ خوای گەورە دەیان پەرسـتن و دەیـان کـردن بـە وەسـیلەو

(١) سورة الأنعام: (٦٣ – ٦٤).

(٢) سورة لقمان: (٣٢).

شەفاعەتکار، وە کاتێکیش توشی ناڕەحەتی و بەلا دەبوون لە بیریان دەچونەوەو پشتیان تێ دەکردن و بە تەواوی ڕوویان لە خوای گەورە دەکرد.

وە پێشتر بۆمان ڕوون بۆوە کە محمد العلوي بە تەواوی مانا کۆك و هاوڕایە لەگەڵ موشریکەکاندا لەو عیبادەتانەی کە بۆ بتەکانیان دەیانکرد، بەلام با بزانین ئەو بەم کۆکی و هاوڕاییە واز دەهێنێت؟

بێگومان نەخێر، بەڵکو زۆر لەوان زیاتر کەوتۆتە ناو شیرك و کوفرو گومڕاییەوە، جا با زیاتر ڕوونی بکەینەوەو بزانین وایە؟!

محمد العلوي دەڵێت:

توجه رسول الله في كل حاجة لنا ومهم في المعاش و في القلب

وە هەروەها دەڵێت:

عليك سلام الله أنت ملاذنا لدى اليسر والإعسار والسهل والصعب

بەم شێوەیەو بە پێی قسەکانی هیچ پێویستیەك لە پێویستیەکانی بۆ خوای گەورە بەجێ نەهێشت، بەڵکو هەموو ئەوانەی بۆ پەرستراوەکەی خۆی داناو وازی لە پەروەردگاری جیهانیان هێنا.

وە هەروەها دەڵێت:

يا غياث الخلق يا ذا الفضل واجود والإحسان في بحر وبر

وە هەروەها دەڵێت:

فلأنت في الدني وفي الأخرى وفي كل المواطن عدتي وندائي

وە هەروەها دەڵێت:

واعطف علي بعفو منك يشملني فإني عنك يا مولاي لم أحد

ئەمەی سەرەوە بنچینەی کوفرو گومڕاییە، وە هەموو دوعاو هیواکانی دا بە پەرستراوەکەی و پەرستراوی حەق و تەنهای پشت گوێ خست و بێ بەشی کرد کە خوای گەورەو بالا دەستە، وە نەك هەر پەرستراوەکەی خۆی نەکرد بە وەسیلەو

شەفاعەتكار" بەڵكو بە تەنهای دانا لە هەموو بوارەكانی پەرستنداو وازی هێنا لەو خوا باڵا دەستەی كە پەرستراوەكەی دەیپەرست.

وە لە پێشتر زانیمان كە شیركی موشریكە كۆنەكان وانەبوو، بەڵكو ئەوان بتەكانیان دەكرد بە وەسیلە بۆ نزیك بونەوە لە خوای گەورەو خوای گەورەیان بە پەرستراوی گەورە دادەنا، بەڵام ئەم پیاوە گومڕایە زۆر بە ڕوون و ئاشكرایی و لە زۆر شوێن لەم دوو كتێبەیدا تەواوی عیبادەتی خۆی بۆ غەیری خوا دەردەبڕێت و واز لە پەرستنی خوای گەورە دەهێنێت، وە داوای هەموو پێداویستیەكانی خۆی لەو دەكات، وەك لەم شوێنانەدا كە دەڵێت: (توجه رسول الله في كل حاجة)، وە دەڵێت: (فلذ به من كل ما تشتكي)، وە لە هەموو كاتێكیشدا هاواری دەكردێ، وەك دەڵێت: (ذا الفضل واجود والإحسان في بحر وبر)، وە دەڵێت: (أنت ملاذنا لدى اليسر والإعسار والسهل والصعب)، یان دەڵێت: (فلأنت في الدني وفي الأخرى وفي كل المواطن عدتي وندائي).

وە زۆر لەوەش زیاتر دەڵێت، بۆ نمونە: (عجل بإذهاب ألذي اشتكي فإن توقفت فمن ذا أسأل؟)، وە دەڵێت: (فإنني عنك يا مولاي لم أحد)، وە دەڵێت: (هذا نزيلك أضحى لا ملاذ له إلا جنابك).

وە هەموو ئەو قسانەش كۆكەرەوەو وەرگێراوی یەك وشەن ئەویش (لا إله إلا أنت)!!!

كەوابوو كام لەم دوانە (موشریكە كۆنەكان یان محمد العلوی) زیاتر كەوتونەتە ناو شیرك و كوفرو گومڕایی و بەد بەختیەوە؟!! ئایا ئەوانەی كە بت و پەرستراوەكانیان دەپەرستن و دەیان كردن بە وەسیلەو شەفاعەتكار بۆ نزیك بونەوە لە خوای گەورە لە كاتی ئاساییدا، وە لە كاتی ناڕەحەتی و تەنگانەشدا خوای گەورەیان بە تەنها دەزانی و پەرستراوەكانیان بیر دەچووەوەو دەهاتنەوە سەر فیترەتی خۆیان و دەیان وت (لئن أنجانا من هذه لنكونن من الشاكرين)؟ یان ئەوەی كە هەموو دوعاو پاڕانەوەو هیواو ئومێدو گشت پەرستنەكان بۆ غەیری خوا ئەنجام دەدات، وە لە هەموو كات و ساتێكدا دڵ و ڕووی لەوەو بە تەواوی پشت بە غەیری خوای گەورە دەبەستێت؟

هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا كە شیرك و هاوبەش دانانی كۆن تەنها لە پەرستن و عیبادەتدا بوو، بەڵام لە پەروەردگاریێتیدا (الربوبیـة) ئـەوان بڕوایان وابـوو کـە تـەنها خوای گەورە دروستكارو ڕۆزی دەرو ژێنەرو مرێنەرەو بەڕێوەبردنی هەموو كاروبارەكان تەنها بە دەستی خوای پەروەردگارەو بەس، وە دانیان بە هـەموو ئەمانـەدا دەنـا بـەبێ هیچ گومان و دودڵیەك، هـەروەك خـوای پـەروەردگار لـە زۆر شـوێن لـە قورئـانی پـیرۆز ئاماژە بەو ڕاستیە دەكات، لەوانەش:

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾[1]، واتە: (وە ئەگەر پرسیاریان لێ بكرێت كە كێ ئاسمانـەكان و زەوی دروست كردووە، ئەوا دەیان وت: خوا دروستی كردوون).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ۝ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ۝ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ﴾[2] واتـە: (پێیـان بڵـێ: كـێ پـەروەردگاری هـەر حـەوت ئاسمانەكانـە؟ وە كـێ پـەروەردگاری عەرشـی گەورەیە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: خوای گەورە پەروەردگاری هەموو ئەمانەیـە، ئنجـا پێیـان بڵێ: ئەی كەوایە بۆ لە خوای گەورەو تاك و تـەنها ناترسـن؟ وە هـەروەها پێیـان بڵـێ: ئەی كێ خاوەنی هەموو ئەو شتانەیە كە لە گەردووندا هەنـە لـەوەی كـە دەیـانبینین و ئەوەش كە نایان بینین؟ وە هەر ئەو شەڕو بەڵاو نارەحەتی لەسەر بەندەكانی لا دەبات و كەس ناتوانێت ئەمانە لەسەر خۆی لاببات، وە هیچ كەس ناتوانێـت بـەبێ ئیزنـی ئـەو شەفاعەت بكات، لە وەڵامی ئەمەشدا دەڵێن: هەمووی بە دەستی خوای گەورەیە، ئنجا

(١) سورة لقمان: (٢٥).

(٢) سورة المؤمنون: (٨٦ - ٨٩).

تۆش پێیان بڵێ: ئەی کەوایە عەقڵ و ژیریتان بۆ کوێ چووەو بۆچی بە تەنها خوا ناپەرستن؟).

وە هەروەها دەفەرموێت:﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴾[1]، واتە: (زۆربەیان ئیمان و بڕوایان بە خوای گەورە نیە، بەڵکو موشریکن و هاوبەشیان بۆ داناوە).

وە ابن عباس ڕەزای خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ئەوان بڕوایان وابوو کە پێیان وترابا: کێ ئاسمانی دروست کردووە؟ وە کێ زەوی دروست کردووە؟ وە کێ چیاکانی دروست کردووە؟ دەیان ووت: (الله)، لەگەڵ ئەوەشدا موشریك بوون)، وە (مجاهد) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (ئیمان لای ئەوان ئەوە بوو کە بڵێن: خوا دروستکارمانە، وە ڕۆزی دەرو مرێنەرمانە، ئەوە ئیمانەکەیان بوو لەگەڵ ئەنجامدانی عیبادەت بۆ غەیری خوای پەروەردگار)[2].

بەڵام ئەم پیاوە (محمد العلوي) هەر بەوەوە نەوەستاوە شیرکی هەبێت لە بواری عیبادەت و پەرستندا، بەڵکو لەوەش زیاتر زۆر سیفەتی خوای گەورە لە پەروەردگارێتیدا دەداتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ و زۆر پێداگریشی لەسەر دەکات، بۆ نمونە:

١. لە وەصفی پێغەمبەردا ﷺ دەڵێت: (الخليفة الأكبر، الممد لكل موجود)[3]، واتە: (گەورەترین جێنشین و بەفریا کەوتوی هەموو بەدی هێنراوێك).

وە هەروەها دەڵێت: (حاڵی ئەوانەی سەردانی دەکەن جیاوازە بۆ سوود وەرگرتنیان و بەفریا کەوتنیان لەو سەردانەیاندا لە خوای گەورە بەهۆی پێغەمبەری هەڵبژاردەو خۆشەویستیانەوە ﷺ)[4].

---

(١) سورة يوسف: (١٠٦).

(٢) تفسير ابن جرير (١٦/٢٨٦-٢٨٧).

(٣) الذخائر (ص٢٣٣).

(٤) شفاء الفؤاد (ص١١٣).

٢. وە هەروەها دەربارەی تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: (توانیویەتی زەویەکان ببڕێت لە پێش کرانەوەیاندا، چونکە خوای گەورە هەموو زەوی کردووە بە موڵکی ئەو.........)[1].

بەڕاستی ئەمە شیرك و هاوەڵ دانانێکی ڕوون و ئاشکرایە لە پەروەردگارێتی خوای گەورەدا، چونکە ئەوەی کە خاوەنی ڕاستەقینەی زەویە تەنها خوای گەورەیەو بەس، وە بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستیە زۆرە، لەوانەش:

- ✓ خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ﴾[2]، واتە: (بۆ ئەوانەی کارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن لە دونیادا، ئەوا خوای گەورە چاکەیەکی زۆریان لەگەڵدا دەکات بە پێ بەخشینی ڕزق و ڕۆزیەکی فراوان و دڵ و دەروونێکی ئاسودە، وە زەوی خوای گەورەش زۆر فراوانەو دەتوانن کە لە شوێنێك ڕێگریان کرد لە عیبادەت کردن بۆ خوای گەورە ئەوێ بەجێ بهێڵن و کۆچ بکەن بۆ شوێنێکی تر).
- ✓ وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَٰعِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ﴾[3]، واتە: (ئەی بەندەکانم ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە بەڕاستی زەوی من زۆر فراوانە، دە کەوایە بە تەنها من بپەرستن).
- ✓ وە هەروەها لەسەر زمانی عەبدو بەندەی خۆی پێغەمبەر صالح سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ﴿وَيَٰقَوْمِ هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ﴾[4]، واتە: (پێغەمبەر صالح سەلامی خوای لێ بێت بە قەومەکەی

---

(١) شفاء الفؤاد (ص٢٢٣).
(٢) سورة الزمر: (١٠).
(٣) سورة العنكبوت: (٥٦).
(٤) سورة هود: (٦٤).

وت: ئەی قەومەکەم ئەمە حوشترێکە لەلایەن خـواوەو بەڵگەیـە بـۆ ئێـوە لەسـەر پێغەمبەرایەتی من، وە وازی لیٚ بهێنن و دەستی بۆ درێژ نەکەن، وە با لـە زەوی خوای گەورەدا بلەوەڕێت و گژوگیا بخوات).

✓ وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱصْبِرُوٓا۟ إِنَّ ٱلْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾[1]، واتە: (موسا بە قەومەکەی وت: پشت بە خوا ببەستن و داوای کۆمەکی لەو بکەن و ئارام بگرن لەسەر ئەوەی کە توشتان دێت، وە بەڕاستی زەوی موڵکی خوایەو دەیبەخشێت بـەو بەندانـەی کـە خۆی ئارەزووی لێیەتی).

وە هەروەها لـە زیـاتر لـە (٣٠) شـوێن لـە قورئـانی پـیرۆزدا خـوای گـەورە موڵکیـەت و خاوەندارێتی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە تیایدایەتی تەنها بۆ خـۆی بڕیـار دەدات و دەیداتـە پـاڵ خـۆی، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[2]، واتە: (ئایا نازانی کە مـوڵکی ئاسمانـەکان و زەوی هـەمووی هی خوای پەروەردگارە).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ لِّلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾[3]، واتـە: (ئـەوەی لـە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەمووی موڵکی خوای گەورەیە).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ قُل لِّمَن مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُل لِّلَّهِ ﴾[4]، واتـە: (بـەو کافرە موشریکانە بڵێ: ئایا ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی کێیە؟ پێیان بڵێ: تەنها هی خوای پەروەردگارە).

---

(١) سورة الأعراف: (١٢٨).

(٢) سورة البقرة: (١٠٧).

(٣) سورة البقرة: (٢٨٤).

(٤) سورة الأنعام: (١٢).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[1]، واتە: (ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەمووی موڵکی خوایەو هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ ٱلثَّرَىٰ ﴾[2]، واتە: (ئەوەی کە لە ئاسمانەکان و زەوی و لە نێوانیاندایەو ئەوەش کە لە ژێر زەویە هەر هەمووی موڵکی خوای گەورەیە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾[3]، واتە: (کلیل و گەنجینەکانی ئاسمانەکان و زەوی هەمووی هی خوای پەروەردگارن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴾[4]، واتە: (گەنجینەو خەزێنەی ئاسمانەکان و زەوی هەموویان هی خوای پەروەردگارن، بەڵام مونافیق و دوو ڕووەکان لێی تێناگەن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴾[5]، واتە: (بەو موشریکانە بڵێ: بانگ کەن و هاوار بکەنە ئەوانەی کە جگە لە خوای گەورە هاواریان دەکەنێ و لێیان دەپاڕێنەوە، وە بەڕاستی ئەوانەی ئێوە هاواریان دەکەنێ و لێیان دەپاڕێنەوە بە ئەندازەی گەردیلەیەکیشیان لە ئاسمانەکان و زەوی بە دەست نیە، بەڵکو هەمووی هی خوای پەروەردگارەو ئەوان هیچ هاوبەشی و شەراکەتێکیان نیە لەگەڵ خوای گەورەو هیچیان پێ ناکرێت).

---

(١) سورة آل عمران: (١٨٠).

(٢) سورة طه: (٦).

(٣) سورة الزمر: (٦٣).

(٤) سورة المنافقون: (٧).

(٥) سورة سبأ: (٢٢).

بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزانەی قورئانی پیرۆز بۆمان دەرکەوت کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لە نێوانیاندایە، هەمووی موڵکی خوای گەورەیەو هیچ هاوبەش و شەریکێکی نیەو بە تەنها درستکارو بەڕێوەبەری هەموویانە.

بۆیە هەر کەسێك گومان ببات و پێی وابێت کە هەر کەسێك لە دروست کراوەکان تەنها یەك گەردیلەی بە دەستەو بەشدارە لەگەڵ خوای پەروەردگاری دروستکاردا، ئەوا بەڕاستی شیرك و هاوبەشێکی ڕوون و ئاشکرای داناوە، وە درۆو بوهتانێکی گەورەی کردووە، وە هەروەها ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کە ووتەی خوای پەروەردگارن بە درۆ دەزانێت، ئەی چ جای ئەوەی کەسێك وا گومان ببات و پێی وابێت کەوا هەموو زەوی موڵکی ڕاستەقینەو تەواوی دروست کراوێکە؟!!

وە بەسە بۆ ئەو پیاوە کە ئەوەندە زاڵم و ستەمکار بێت و کافر بێت بەو شتەی کەوا بت پەرستە کۆنەکان بڕوایان پێی هەبوو، ئەوانەی کە قورئان شاهێدیان بۆ دەدات دەربارەی دان پیادا نانیان بە پەروەردگارێتی دروستکارو خاوەندارێتی تەواوی بەسەر زەوی و هەموو ئەو شتانەی کە تیایەتی، وەك خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێت:

﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾[1]، واتە: (بەوانە بڵێ کە بڕوایان بە زیندوو بونەوە نیە: ئایا زەوی و ئەوەی کە تیایدایەتی موڵکی کێیە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: هی خوای گەورەیە، تۆش پێیان بڵێ: دەی کەوایە بۆ بیر ناکەنەوەو بە تەنها ئەو ناپەرستن؟).

وە ئەگەر خوای گەورە لە کارو شتێکی کەم بایەخدا خۆی بێ شەریك و بێ پێویست بزانێت، کە ئەویش زەوی دونیای بڕاوەیە، کە لای خوای گەورە باڵە مێشولەیەك ناهێنێت، ئەی دەبێت دەربارەی زەوی نەبڕاوەو بێ کۆتایی بەهەشت چۆن بێت؟!

بێگومان بەهەشتیش بە هەمان شێوە چەندەها ئایەتی لەسەرە کە هەمووی بە دەستی خوای گەورەیەو هەر ئەو خاوەنیەتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ

(١) سورة المؤمنون: (٨٤ – ٨٥).

ﭐلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴾[1]، واتە: (ئەو بەهەشتەی کە ئامادەمان کردووە دەیبەخشین بەو بەندە چاکانەمان کە لە خوا ترسن و تەقوای خوای گەورە دەکەن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴾[2]، واتە: (کاتێک ئیمانداران دەچنە بەهەشتەوە دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەو بەڵێنەی پێی دابووین هاتە دی و خستینیە ناویەوە، وە کردینی بە میرات گری زەوی بەهەشت و لەهەر شوێنێکی ئارەزومان لێی بێت لێی نیشتەجێ دەبین، بەڕاستی ئەوەش باشترین پاداشتی ئەوانەیە کە کردەوەی چاکیان ئەنجام دەدا لە دونیادا).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴾[3]، واتە: (ئەی نەفسی پاک و چاک و ئارام گرتوو، بگەڕێوە لای پەروەردگارت کە هەموو نیعمەتەکانی خۆی بەسەردا ڕشتی، وە ڕازی بە هەموو ئەو نیعمەتانەو لەو پاداشتەی کە بۆت ئامادە کراوە، بچۆرە ناو بەندە چاکەکانمەوەو ناو بەهەشتەکەمەوە).

٣. وە هەر دەربارەی تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: (وە زانیاری هەموو شتێکی پێدراوە، تەنانەت ڕۆح و ئەو پێنج شتەش کە لە ئایەتی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ ....... ﴾)[4].

وە هەر لە شوینێکی تردا دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: (وە هیچ جیاوازیەک نیە لە نێوان ژیان و مردنیدا لە بینینی ئوممەتەکەی و زانین و ئاگادار بوونی لە کاروباریان و

---

(١) سورة مريم: (٦٣).

(٢) سورة الزمر: (٧٤).

(٣) سورة الفجر: (٢٧ - ٣٠).

(٤) الذخائر (ص٢٥)، والآية في سورة لقمان: (٣٤).

نیەت و هەموو ئەو شتانەی کە دەیکەن و دەیانەوێت بیکەن، وە ئەوەش لەلای من زۆر ڕوونەو هیچ گومانێکی تیادا نیە)[1].

گومانی تیادا نیە کە ئەم بۆچونەشی شیرك و هاوەڵ دانانێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایەو هیچ تەمومژێکی لەسەر نیە، وە دژایەتی کردنی خوای گەورەیە لە گرنگترین ئەو سیفەتانەی کە هەیەتی، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ ﴾[2]، واتە: (لەو شتانەی کە زانیاری دەربارەیان تەنها خوای گەورە دەیزانێت ئەو پێنج شتەیە کە خوای گەورە باسیان دەکات و جگە لە خۆی هیچ کام لە دروست کراوەکانی نایزانن، ئەوانیش: هاتنی ڕۆژی قیامەت تەنها خۆی دەیزانێت، وە هەر ئەویش دەزانێت باران کەی دەبارێت و وە ئەوەی هەڵی گرتووە خێرو بەرەکەتە یان بەڵاو موصیبەتە، وە هەر ئەویش دەزانێت کە ئەوەی لەناو ڕەحمی ئافرەتدایە نێرە یان مێ، وە کەسێکی باش دەردەچێت یان خراپ، وە هیچ کەسێکیش نازانێت کە بەیانی چی دەکات و چی بەسەر دێت، وە هیچ کەسێکیش نازانێت کە لە کوێ و لەسەر چ زەویەك دەمرێت، بەڕاستی هەر خوای گەورە شارەزاو بە ئاگایە بە هەموو شتێك).

وە ئەمانەش کلیلی زانیاریەکانی غەیبن کە تایبەتی خوای گەورەن و تەنها خۆی شارەزایانەو دەیان زانێت، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴾[3]، واتە: (وە کلیلەکانی غەیب و زانیاری

---

(١) شفاء الفؤاد (ص٧٩-٩٧).

(٢) سورة لقمان: (٣٤).

(٣) سورة الأنعام: (٥٩).

بوون دەربارەیان تەنها لای خـوای پـەروەردگارەو هـیچ كەسـێك نایانزانێـت تـەنها ئـەو نەبێت، وە هەر ئەویش دەزانێت كە چی لە وشكانی و ناو دەریاكانـدا هەیـە، وە گـەڵای هەر درەختێك هەڵدەوەرێت ئەوا خوای گەورە پێی ئاگادرە، وە دەنكی هـەر بەرهـەم و كشتوكاڵێكیش كە لە تاریكایی زەویدایەو هەر بەرهەمێكی تەڕو وشكیش هـەر هـەمووی زانیاریەكانی لای خوای گەورەن و لە (لوح المحفـوظ)دا نوسراوە)، وە كـە دەفـەرموێت: (لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ) ئـەوە زۆر ڕاشـكاوانە نـەفی زانـینی ئـەو زانیـاری و شـتە پەنهانانـە دەكات لە جگە لە زاتی گەورەو دەسەڵات داری خۆی لە فریشتەو نێردراوەكانی.

وە هـەروەها خـوای پـەروەردگار بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴾[1]، واتە: (بڵێ ئەی محمد: هەر شتێك كە لە ئاسمانەكان و زەویدایە غـەیب نازانێـت تـەنها خـوای گـەورەو بـاڵا دەسـت نەبێت، وە ناشزانن كەی زیندوو دەكرێنەوە).

وە لەوەش ڕاشكاوانەتر خوای پـەروەردگار دەربـارەی پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێت: ﴿ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴾[2]، واتە: (بڵێ: من نـاڵێم كـە خەزێنەو كلیلەكانی ڕزق و ڕۆزی خوای گەورە لای منن، وە من هیچ شتێكیش لە غـەیب نـازانم، وە ناشـڵێم مـن فریشـتەم، وە تـەنها شـوێن ئـەوە دەكـەوم كـە بـە وەحـی بـۆم هاتووەو خەڵكیشی بۆ لا بانگ دەكەم، وە پێیـان بڵـێ: ئایـا ئـەو كەسـەی كـە نابینایـە وەك ئەو كەسە وایە بەرچاو ڕوونەو ڕاست و چەپی خۆی لێك جیا دەكاتـەوە؟ ئـەی بـۆ بیر ناكەنەوەو بە هۆش خۆتان نایەنەوە؟).

---

(١) سورة النمل: (٦٥).

(٢) سورة الأنعام: (٥٠).

وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾[1]، واتە: (بڵێ ئەی محمد: بەڕاستی من هیچ قـازانج و زەرەرێكم بـۆ نەفسی خۆم بەدەست نیە تەنها ئەوە نەبێت كە خوای گەورە دەیـەوێت، وە ئەگـەر مـن غـەیبم زانیبایە ئەوا خێرم بۆ خـۆم زیاد دەكـردو بـەڵاو شەڕیشم لـە خـۆم دوور دەخـستەوە، بەڕاستی من تەنها وریاكەرەوەو مژدەدەرم بۆ ئیمانداران).

وە هـەروەها دەربـارەی (ڕۆح)یـش ئـەوا گـوێ بیـستی ووتـەی یـەكلا كـەرەوەی خـوای گەورە ببە كە دەفـەرموێت: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا﴾[2]، واتە: (وە پرسیارت لێ دەكەن دەربـارەی ڕۆح، تـۆش پێیـان بڵـێ: بەڕاسـتی ڕۆح وەك هـەموو دروسـتكراوەكانی تـر دروسـتكراوی خـوای گەورەیـەو لـەژێر فـەرمانی ئەودایـە، وە ئێـوەش تـەنها كـەمێك زانیـاری نـەبێت هیـچی ترتـان پـێ نەدراوە).

وە هــەروەها دەربــارەی كــاتی ڕۆژی دوایــی دەفــەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ثَقُلَتْ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنْهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾[3]،

واتە: (پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی هاتنی ڕۆژی دوایـی و دەڵـێن كـەی ڕوو دەدات؟ تۆش پێیان بڵێ: بەڕاستی زانینی كاتی ڕوودانی تـەنها خـوای گـەورە دەیزانێـت و هـیچ كەسێكی تـر زانیـاری نیـە دەربـارەی و زانینـی ئـەو كاتـە زۆر گـران و قورسـە لەسـەر ئاسمانەكان و زەوی، وە بە كتوپڕی دێت و كەس ناتوانێت لەو كاتەدا خۆی بـۆ ئامـادە بكات، وە وا پرسیار لـە تـۆ دەكـەن وەك ئـەوەی كـە تـۆ زۆر بـە دوای ئـەو پرسیارەدا

(١) سورة الأعراف: (١٨٨).

(٢) سورة الإسراء: (٨٥).

(٣) سورة الأعراف: (١٨٧).

بگەڕێیت و نازانن كە تۆ لەگەڵ ئەو هەموو باوەڕە تەواوەی كە خـوا هێناوتـە زۆر خـۆت بەو پرسیارەوە گرفتار ناكەیت و بیری لێ ناكەیتەوە، چـونكە دەزانیـت كـە ئـەوە هـیچ كەسێك نایزانێت تەنها خوای گەورە خۆی نەبێت، بۆیە پێیان بڵـێ: زانیـاری بـوون بـەو ڕۆژە تەنها خوای گەورە دەیزانێت).

وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِ ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴾[1]، واتـە: (خـەڵكی پرسـیارت لـێ دەكـەن دەربـارەی ڕۆژی قیامەت، تۆش پێیـان بڵـێ: تـەنها خـوای گـەورە زانیاریـەكانی ئـەو ڕۆژە دەزانێـت، وە هاتنی ڕۆژی قیامەت و زانینی كاتەكەی كە زوو دێت یان درەنگ ئەوەندە گرنگ نیە بـە ئەندازەی ئەوەی كە مرۆڤ لـەو ڕۆژەدا ڕزگـاری دەبێـت و دەچـێت بـۆ بەهەشـت، یـان شایانی سزاو عەزابەو دەخرێتە دۆزەخەوە).

وە هــــەروەها دەفــــەرموێت: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۝ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ۝ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ۝ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴾[2]، واتە: (پرسیارت لـێ دەكـەن دەربـارەی قیامـەت كـە كـەی دێت، ئایـا زانـینی كـاتی هـاتن و ڕوودانـی چ سـودێكی هەیـە بۆتـان، بـەڵكو سودەكەی لەوەدایە كە بە نهێنی بمێنێتەوەو خۆتانی بۆ ئامادە بكەن، وە زانینی كاتی ڕوودانی هـەر لای خـوای گەورەیـە بـە تـەنها، وە تـۆ تـەنها ترسـێنەرو وریـا كـەرەوەی بۆیان، وە هەر ئەو وریا كردنەوەیەش سودو قازانجی تیادایە بۆ ئەوان).

ئەوەبوو خـوای گـەورە بـۆی ڕوون كردینـەوە كـە عەبدو نێردراوەكـەی ﷺ دەربـارەی كاتی هاتنی قیامەت و ڕۆح هیچ شـتێك نازانێـت و فـەرمانی پـێ دەكـات كـە تـەنها ئـەو شتانە ڕابگەیەنێت كە خۆی فەرمانی پێ كردووە، كەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەم پیـاوە ئایەتی خوای گەورە بە درۆ دەزانێت و ڕەخنە لە فەرمان و حوكمی خوا بگرێت ! ! !

(١) سورة الأحزاب: (٦٣).

(٢) سورة النازعات: (٤٢ – ٤٥).

وە چـەندەها فـەرمودەی صـەحیحیش لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ گێڕدراونەتـەوە کـە هەموویان ئەوە دەردەخەن کـەوا پێغەمبـەر ﷺ هـیچ شـتێك لـە غـەیب و لەوانـەی کـە باسمان کردن نازانێت، بەڵام لەبەر درێژبونەوەی بابەتەکە فەرمودەکان باس ناکـەین و بە ئایەتەکان کۆتایی پێ دەهێنین، وە کەسێکیش بە ئایەتـەکان بڕوا نـەکات کـە هـیچ گومانێـك ناهێڵنـەوە، ئـەوا بـە دڵنیاییـەوە بـە فـەرمودەکانیش بـڕوا ناکـات، وە وەك وتوشیانە: ئەو کەسە کەسە یەك حەرفی بەسە.

## ووتەی پێشینە چاکەکان سەبارەت بە عیلمی غەیب

جگە لەم هەموو ئایەت و فەرمودانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە زانیاری بوون دەربارەی (غەیب) هەمووی لای خوای پەروەردگارە، وا باشە ئاماژە بە ووتەی پێشەوایانیش بدەین کە هەموویان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی کە هیچ یەکێك لە دروست کراوەکانی خوای گەورە، تەنانەت فریشتەو پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێت کەم و زۆر زانیاریان نیە دەربارەی غەیب تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە خۆی پێی ڕاگەیاندون و فێری کردوون، لەو ووتانەش:

أ. دایکی ئیمانداران (عائشة) ڕەزای خوای لێ بێت:

بە صەحیحی لێوەی گێڕدراوەتەوە کە فەرمویەتی: (من حدثك أنه يعلم ما في غد فقد كذب) ثم قرأت: ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾)[1] ، وفي لفظ: (من حدثك أنه يعلم الغيب فقد كذب)[2] ، واتە: (هەر کەسێك پێی وتی کەوا پێغەمبەر ﷺ دەزانێت بەیانی چی ڕوو دەدات، ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە درۆ دەکات) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا﴾، وە لە ووتەیەکی تردا: (هەر کەسێك پێی وتی کەوا پێغەمبەر ﷺ غەیب دەزانێت، ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە درۆ دەکات).

ب. پێشەوا ابن كثير ڕەحمەتی خوای لێ بێت:

لە تەفسیری ئایەتی ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ السَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَاهَا قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّي﴾دا دەڵێت: (خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە ئەگەر پرسیاریان لێ کرد دەربارەی کاتی قیامەت، ئەوا ئەم زانیاری و ئاگا لێ بونە بگێڕەوە بۆ لای خوای گەورە، چونکە

---

(١) صحيح: متفق عليه، اللؤلؤ والمرجان (٤١/١).

(٢) صحيح: أخرجه البخاري (٤٦١/١٣).

بەڕاستی هەر ئەو بە تەنها كاتەكەی دەزانێت و دەزانێت كەی ڕوو دەدات، وە ئەمەش هیچ كەس نایزانێت تەنها ئەو نەبێت)[1].

ج. پێشەوا ابن حجر العسقلاني ڕەحمەتی خوای لیّ بێت:

ابن حجر لە شەرحی چیرۆكی خضر لەگەڵ موسی سەلامی خواییان لیّ بێت و دەربارەی ئەو پرسیارانەی كەوا خضر لە موسای دەكات تا بیناسێت، دەڵێت: (ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەران سەلامی خوایان لیّ بێت و ئەوانەش كە لە خوار پلەی ئەوانەوەن هیچ شتێك دەربارەی غەیب نازانن تەنها ئەوە نەبێت كە خوای گەورە فێری كردون، چونكە ئەگەر خضر هەموو غەیبی زانیبایە ئەوا موسای دەناسی پێش ئەوەی پرسیاری لیّ بكات)[2].

وە وتەی پێشەوایان و زانایان زۆر لەوە زیاترە كە بهێنرێنەوە بۆ پوچەڵ كردنەوەی شوبهەكانی ئەم پیاوەو هاوشێوەكانی، بەڵام بەوەندە كۆتایی دەهێنین و بۆ زانیاری زیاتر دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر تەفسیرەكانی قورئان و شەرحی فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ.

٤. وە یەكێكی تر لەو تایبەتمەندیانەی كە تایبەتی پێغەمبەرە ﷺ بە گومانی خۆی، ئەوەیە كە دەڵێت: (بەڕاستی ئەو گویّ بیستی جوڵەی مێواشی باڵەكانی جبریل دەبوو لە كاتێكدا زۆر دوور بوو لە (سدرة المنتهی)، وە هەروەها بۆنی ئەوی دەكرد كاتێك ڕووی تیّ دەكرد بۆ هێنانی وەحی)[3].

وە هەروەها دەڵێت : (ئەی ئەو كەسەی بانگی دەكەین و گوێی لێمانە لەگەڵ دووری ماوەی نێوانیشمان ئەو نزیك نزیك دەیبستێت)[4].

(١) تفسير ابن كثير (٢/٢٧٢-٢٧٣).

(٢) فتح الباري (١/٢٢٠).

(٣) الذخائر (ص٢٢٨).

(٤) شفاء الفؤاد (ص٢١٢).

بەسە بۆ وەڵامی ئەم زیادەڕەویانە کە بوترێت: ئەم درۆو بوهتان و قسە بێ بنـچینانەت لە کوێوە هێناوە کە پێغەمبەر ﷺ گوێی لە جوڵەی هێواشـی باڵـەکانی جبریل بـووەو بۆنی ئەوی کردووە، لە کاتێکدا ئەو لە (سدرة المنتهى) بووە؟

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ ﴾[1]، واتــە: (ئەوانــەی درۆو بوهتــان بــڵاو دەکەنــەوە ئەوانەن کە ئیمان و بڕوایان بە ئایەتەکانی خوای گەورە نیە، وە هەر ئەوانە درۆزنن).

وە ئەو سیفەتی بیستنەش کە دەیداتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ ئەوە تەنها شایستەی خـوای پەروەردگارەو هەر ئەو ئاستی بیستنی بەم شێوەیە فراوانـە، وە هـەر بـۆ ئـەویش وەك یەك وایە ئەو شتەی کە دەیبیستێ کە زۆر لە نزیکەوە بێت، یـان لـەو پـەڕی دوورییـەوە بێت، یان ئەو قسەیە بە ئاشکرا بکرێت یان بە نهێنی، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت:

﴿ سَوَاءٌ مِّنكُم مَّنْ أَسَرَّ الْقَوْلَ وَمَن جَهَرَ بِهِ وَمَنْ هُوَ مُسْتَخْفٍ بِاللَّيْلِ وَسَارِبٌ بِالنَّهَارِ ﴾[2]، واتــە: (هــەر یــەکێکتان قــسەیەك دەرببڕێــت یــان بیــشارێتەوە، یــان هــەر گیانلەبەرێك بە تاریکایی شەو خۆی بشارێتەوە یان لەبەر ڕوناکی خـۆردا خـۆی ئاشـکرا بکات، لە لای خوای گەورە وەك یەك وایەو ئاگای لە هەموویان هەیە).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ ﴾[3]، واتە: (ئەی محمد: خـوای گـەورە قـسەی ئـەو ئافرەتەی بیست کە لەگەڵتدا کەوتبووە گفتوگۆو سـکاڵای خـۆی بـۆ لای خـوای گـەورە بەرز کردەوە، خوای گەورەش گفتوگۆکەی بیست و بەڕاستی خوای گەورە زۆر بیـسەرو بینـەرە).

---

(١) سورة النحل: (١٠٥).

(٢) سورة الرعد: (١٠).

(٣) سورة المجادلة: (١).

وە هەروەها دایكە عائشە ڕەزای خوای لیٚ بیٚت دەفەرمویٚت: (سوپاس بۆ ئـەو خوایـەی كە بیستنی فراوانەو هەموو دەنگیٚك دەبیستیٚت، بەڕاستی گفتـو گۆیـەك ڕوویـدا لەگـەڵ پیٚغەمبەر ﷺ و قسەی دەكرد، وە من لە گۆشـەیەكی ماڵەكـە بـووم نـەم دەبیـست كـە ئەوان چی دەڵیٚن، كەچی خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد: ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا ...... ﴾.

وە هەر دەربارەی ئەم ڕوداوەو لە ووتەیەكی تردا دەڵیٚـت: (گـەورەیی بۆ ئـەو خوایـەی كـەوا بیـستنی فراوانـەو هـەموو شـتیٚك دەبیستیٚت، كەچـی مـن هەنـدیٚ لـە قـسەكانی خەولەی كچی ثەعلەبەم دەبیست و هەنیٚكیشیم نەدەبیست)[1].

وە ئـەم دوو سـیفەتەش كـە سـیفەتی (بیـستن و نزیـك بـونن) لـە سـیفەتە گـەورەو بـەرزەكانی خـوای پـەروەردگارن و تـەنها شـایان و شایـستەی ئـەون و بـە هـیچ شیٚوەیەكیش سیفەتی كـورت و كـەم توانـای دروسـت كراوەكـان لـە هـی خـوای گـەورە ناچن، وە باسـی ئـەم دوو سـیفەتەش لـە فـەرمودەی صـەحیح و قورئـانی پـیرۆزدا زۆر هاتووە.

بۆ نمونە كاتیٚك پیٚغەمبەر ﷺ گویٚی لـە هـاوەڵان بـوو بـە دەنگـی بـەرز (الله أكـبر)یـان دەكرد، پیٚی فەرموون: (بەڕاسـتی ئیٚـوە بـانگی كەسـیٚكی كـەڕو غائیـب ناكـەن، بـەڵكو بانگی كەسیٚك دەكەن كە زۆر بیسەرەو نزیكەو لەگەڵتاندایە)[2].

وە سـیفەتی نزیكـی (القـرب) بـە تـەنهایی لـە قورئانـدا هـاتووە كـە خـوای گـەورە دەفـــــــــەرمویٚت: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾[3]، واتە: (ئەگەر عەبدەكەم داوام لیٚ بكات و لیٚم بپاڕیٚتەوە، ئەوا بەڕاستی من زۆر نزیكم، وە وەڵامی ئەو كەسە دەدەمەوە كە هاوارم دەكاتیٚ و لیٚم دەپاڕیٚتەوە).

---

(١) صحيح: أخرجه البخاري تعليقاً (١٣/٣٧٢)، وانظر تفسير ابن كثير (٤/٣١٨).

(٢) صحيح: متفق عليه، اللؤلؤ والمرجان (٣/٢٢٧).

(٣) سورة البقرة: (١٨٦).

وە لێرەدا دەڵێم: باشە کەسێك گـوێی لـە جوڵـەی هێواشـی باڵـەکانی جبریـل ببێـت لـە کاتێکدا ئەو لە (سدرة المنتهى) بووەو زۆریش لێی دوور بووە، ئـەی باشـە دەبێـت چـۆن ئەو قسەو ووتانە نەبیستێت کە بە چەندان قات زیاتر لەوە لێوەی نزیك بووە؟!

بۆ وەڵامی ئەمەش با سەیری ئەم بەسەرهاتە بکـەین کـە عمرانـی کـوڕی حـصین ڕەزای خوای لێبێت باسی بەسەرهاتی خـەو لێکـەوتنی پێغەمبـەر ﷺ و هـاوەڵانی دەکـات لـە سەفەرێکیاندا کـە بەخـەبـەر نـەهاتوون بـۆ نوێـژی بـەیانی تیایـدا دەڵێـت: (هـیچ شـتێك خەبەری نەکردینەوە تەنها گەرمای تیشکی خۆرەکە نـەبێت، وە پێغەمبـەر ﷺ کاتێـك خەوت بە خەبەر نەهات هەتا ئەو بەخەبەری نەهێنا، وە ئێمەش نەمان دەزانی چـی لـە خەوەکەی ئەودا ڕووی داوە، وە کاتێك کە (عمر) ڕەزای خوای لێ بێت خەبەری بـووە، وە بـینی کـە ئـەم خەڵکـە توشـی چـی بـوون، (الله أکـبر)ی کـردو دەنگـی خـۆی بـەرز کردەوە، وە بەردەوام (الله أکبر)ی دەکردو دەنگی خۆی بەرز دەکردەوە تا ئەو کاتـەی کە پێغەمبەر ﷺ بە دەنگی ئەو بەخەبەر هات)[1].

کەواتە: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ گوێی لە (الله أکـبر)ی (عمـر) نـەبوبێت ڕەزای خـوای لـێ بێت تەنها دوای ئەو کاتە نەبێت کەوا دەنگی زیاتر بەرز کردۆتەوە، ئەوە لە کاتێکدا کە (عمر) ڕەزای خوای لێ بێت لە تەنیشتیەوە بـووە، ئـەی چـۆن گـوێی لـە دەنگـی ئـەو کەسە دەبێت کە لە دورەوە بانگی دەکات و هاواری دەکاتێ و لێی دەپاڕێتەوە؟!!

وە جارێکیـان (جبریـل) سـەلامی خـوای لـێ بێـت هـات بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ لەسـەر شێوەی کەسێکی ئەعرابی و چۆکەکانی نوساند بە چۆکی پێغەمبەرەوە ﷺ و پرسیاری لێ کردو قسەی لەگەڵدا کردو دواتر ڕۆیشت، کەچی پێغەمبـەر ﷺ (جبریـل)ی نەناسـی تا ئەو کاتەی کە بەجێی هێشت.

---

(١) صحيح: رواه البخاري (١/٤٤٧)، ومسلم (٦٨٢).

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لیّ بێت دەڵێت: (ئەم ڕیوایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ (جبریل)ی نەناسیوە تەنها لە کۆتایی کاتەکەدا نەبوبێت)[1].

٥. وە هەروەها ئەم پیاوە لە مەدحی پێغەمبەردا ﷺ دەڵێت:

بنور رسول الله أشرقت الدنيا ففي نوره كل يجئ ويذهب[2]

واتە: (بە نوری پێغەمبەری خوا ﷺ دونیا ڕووناك بۆتەوە، وە بە هۆی نوری ئەوەوە هەموو شتێك دێن و دەڕۆن).

وە هەروەها دەڵێت:

أنت سر الله والنورُ الذي سار موسى نحوه في طور سنين[3]

فهو نور لا يسامى إنه قبس من نور رب العالمين

كيف لا والسيد الهادي به يغمر الدنيا بنور مستبين[4]

هیچ گومانی تیادا نیە کە بەڕاستی ئەمەش لادانی ئەم سیفەتەیە لە خوای گەورەو دەیداتە پاڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کە دروست کراوی خوای گەورەیە، وە هەروەك چۆن خوای گەورە خۆی بەم سیفەتە وەصف دەکات، بە هەمان شێوەش پێغەمبەر ﷺ بەو سیفەتەی خوای گەورە وەصف دەکات، وە قسەی ئەم پیاوەش بە درۆ زانینێکی ڕاستەوخۆی فەرمودەکانی خواو پێغەمبەری خۆشەویستمانە ﷺ.

ئەوەتا خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا خۆی بە نور وەصف دەکات و دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌ﴾[5]، واتە: (خوای گەورە نورو ڕۆشنایی ئاسمانەکان و زەویە، وە وێنەی نورەکەی وەك تاقێك وایە کە چرایەکی گەورەی تیادا بێت).

---

(١) فتح الباري (١/١٢٥).

(٢) شفاء الفؤاد (ص٢٠٥).

(٣) لە کتێبەکەدا نوسراوە (في طور سين).

(٤) شفاء الفؤاد (ص٢٣٢).

(٥) سورة النور: (٣٥).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾[1]، واتە: (وە زەوی ڕووناك و ڕۆشن بۆوە بە نوری پەروەردگاری)، کەچی ئەم پیاوەش دەڵێت: (بە نوری پێغەمبەر ﷺ دونیا ڕووناك بۆتەوە)!!!

وە هەروەها لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە ابن عباس دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە شەودا هەڵدەستا بۆ ئەوەی شەونوێژ بکات دەیفەرموو: (اللهم لك الحمد أنت نور السموات والأرض.....)[2] ،واتە: (خوایە گیان سوپاس و ستایش بۆ تۆ، وە تۆ نوری ئاسمانەکان و زەویت).

وە هەروەها لە ئەبو ذەرەوە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئایا پەروەردگارت بینی؟ ئەویش فەرموی: (نور أنی أراه)، وفي لفظ: (رأيت نوراً)[3] ، واتە: (نورەو چۆن بیبینم)، وە لە ووتەیەکی تردا: (نورێکم بینی).

---

(١) سورة الزمر: (٦٩).

(٢) صحيح: متفق عليه اللؤلؤ والمرجان (١/١٤٧).

(٣) صحيح: أخرجه مسلم (١٧٨).

ئەم پیاوە هەر بەوە نەوەستاوە کە شیرك و هاوبەش بۆ خوای گەورە دابنێت لە سیفەت و کردارەکانیدا، بەڵکو شیرکی گەورەترو کوفری زیاتریشی کردووە، وە خۆی گەیاندۆتە ناوە جوانەکانی خوای گەورەو ئەو ناوانەی کە خوای گەورە تایبەتی کردوون بۆ خۆی و خۆی پێ وەصف کردوون، ئەو هەستاوە بە پێدانی زۆرێك لەو ناوە جوان و سیفەتە بەرزانە بە هەندێ لە دروست کراوەکانی، لە کاتێکدا ئەم ناوانە وەك ئاماژەمان پێدا تایبەتی خوای گەورەن، لەوانەش:

- ✓ یەکێ لەو زیکرانەی ئەم پیاوە دایهێناوە بریتیە لە سەلام کردن لە کاتی سەردانی قەبری پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە کە دەڵێت: (السلام علیك یا أول، السلام علیك یا آخر، السلام علیك یا باطن، السلام علیك یا ظاهر)[1].
- ✓ وە لەوەش زیاتر دەربارەی تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: (سمي من أسماء الله تعالی بنحو سبعین اسماً)[2] ، واتە: (بە نزیکەی (٧٠) ناو لە ناوەکانی خوای گەورە ناونراوە).
- ✓ پاشان بەم زیادەڕەوەیەش واز ناهێنێت، بەڵکو دەگاتە ئەوپەڕی هاوبەش بۆ خوا دانان و دەڵێت: (فالأسماء الإلهیة لە أیضاً أسماء)[3] ، واتە: (لە ناوەکانی پەرستراوێتیدا ئەویش بە هەمان شێوە ناوی هەیە).

ئەمە ئەو پیاوەیە کە قسەکانیتان بینی و خوێندتانەوە، کە پێغەمبەری ﷺ کردووە بە شەریك و هاوەڵی خواری گەورە لە ناوو سیفەتە جوانەکانیدا، لە کاتێکدا هەموو ئەو ناوە جوانانە تایبەتی خوای گەورەن وبەس.

---

(١) شفاء الفؤاد (ص١٢٠).

(٢) الذخائر (٢٠٢).

(٣) شفاء الفؤاد (١٢٦).

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾[1]، واتە: (خوای گەورە کۆمەڵێك ناوو سیفەتی جوان و بەرزی هەنە، بەو ناوو سیفەتە جوان و بەرزانە لێی بپاڕێنەوە، وە ئەوانەی لادەدەن لەو ناوە جوانانەو ماناکەیان دەگۆڕن، یان بەکاریان دەهێنن بۆ کەسانێك کە دەیان پەرستن، وەك ئەوەی کە موشریکەکان بەو ناوانە بت و پەرستراوەکانی خۆیانیان پێ ناو دەنا، ئەوا توشی سزاو عەزابێکی توندو بە ئێش دەبن).

(ابن جریرو جگە لەویش لە ڕاڤەکارانی قورئان باسیان لەوە کردووە کە لادانی موشریکەکان لە ناوەکانی خوای گەورەدا ئەوەبوە کە ئەم ناوانەیان بۆ بتەکانی خۆیان بەکارهێناوە، وەك ناوی (اللات) کە لە (الله) وەریان گرتووە، وە ناوی (العزی) کە لە ناوی (العزیز) وەریان گرتووە، وە (المنات) کە لە ناوی (المنان) وەرگیراوە)[2].

کەواتە ئەگەر ناونانی چەند بت و صەنەمێك بە هەندێك لە ناوە جوانەکانی خوای گەورە، ئەگەر یەك ناویش بێت، بە کوفرو شەریك بۆ خوا دانان لە قەڵەم بدرێت، ئەی دەبێت ئەگەر هەموو ناوەکانی خوای گەورە بۆ دروست کراوێکی بەکار بهێنرێت دەبێت چۆن بێت؟!!

وە ئەگەر وەرگرتنی ناوێك لە ناوەکانی خوای گەورەو دانانی بەسەر پەرستراوێکدا جگە لە خوای گەورە وەك (لات وعوزا) خاوەنەکەی بە موشریك دابنرێت و بچێتە ڕیزی مولحیدەکانەوەو هەڕەشەی توندی لێکرابێت، ئەی دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت کە زۆربەی هەرە زۆری ناوەکانی خوای گەورە بۆ دروست کراوێك لە دروست کراوەکانی خوای گەورە بەکار بهێنێت؟ وەك ناونانی ئەو کەسە بە (الأول والآخر والظاهر والباطن)، وە بیگەیەنێتە ئاستێك کە (٧٠) ناو لە ناوەکانی خوای گەورەی بۆ دابنێت؟!!

---

(١) سورة الأعراف: (١٨٠).

(٢) انظر فتح القدیر (٢/٢٦٨).

پاش ئەم بابەتانەی پێشوو، با بزانین ئەم پیاوە دەست هەڵدەگرێت و پەشیمان دەبێتەوە لەم هەموو شیرکە ئاشکراو ڕونانەی باسی لێوە کردوون؟

بێگومان نەخێر، بەڵکو زیاتر لەوەش دەڵێت و دەگاتە سەر فریشتە بەڕێزەکانیش کە پارێزراون لە هەموو گوناهو تاوانێك و سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە ناکەن.

وە بەتەنها باس لە کۆمەڵێکیشیان ناکات، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی هەموویان دەگرێتەوە، تەنانەت (جبريل)یش سەلامی خوای لێ بێت.

وە لەو قسانەش کە دەیڵێت بەرامبەر بە فریشتەکان:

- ✓ دەربارەی تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: (ذكر الملائكة له في كل ساعة)[1] ، واتە: (فریشتەکان لە هەموو کاتێکدا زیکرو یادی پێغەمبەر ﷺ دەکەن).
- ✓ وە هەروەها دەڵێت: (لسناك حين بدا بآدم أقبلت رعياً لسيماك الملائك تسجد)[2].
- ✓ وە هەروەها دەڵێت: (كلما لحت للملائك خروا في السموات سجداً وباكياً)[3].
- ✓ وە هەروەها کاتێکیش باسی ئەو سەلام کردنە داهێنراوو پڕ لە شیرکە دەکات لەلای قەبری پێغەمبەر ﷺو دەڵێت: (السلام عليك يا أول، السلام عليك يا آخر، السلام عليك يا باطن، السلام عليك يا ظاهر)، لە دواییدا دەڵێت: (ويقال: إن ذلك من تحية جبريل للنبي ﷺ)[4]، واتە: (وە ئەوەش لە سەلام کردنی جبريل بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ).

---

(١) الذخائر (ص٢٠٢).

(٢) شفاء الفؤاد (ص٢١٦).

(٣) شفاء الفؤاد (ص٢٣٥).

(٤) شفاء الفؤاد (ص١٢٠).

گومانی تیادا نیە کە ئەمەش ئەوپەڕی ستەم و درۆو بوهتانە کە ئەم کوفرە گەورەیە بدرێتە پاڵ بەرێزترین و پاکترین دروستکراو کە دوورن لە هەموو عەیب و ناتەواویەك و پارێزراون لە هەموو گوناهو سەر پێچیەك، هەروەك خوای گەورە شاهێدی ئەمەیان بۆ دەدات و دەفەرموێت: ﴿ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴾[1]، واتە: (فریشتەکان سەرپێچی فەرمانەکانی خوای گەورە ناکەن، وە هەر فەرمانێکیشیان پێ کرابێت ئەوا ئەنجامی دەدەن).

بەڕاستی جێگای سەرسوڕمانە کە ئەم پیاوە درۆزن و بوهتان کارە جورئەت بکات کە ئەم درۆ ڕوون و ئاشکرایانە بکات، وە دەپرسین" ئایا ئەم زانیاریەی لە کوێوە بۆ هات کە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە فریشتەکان لە هەموو کاتێکدا زیکری دەکەن؟! وە ئایا کێ ئەم درۆو بوهتانەی بە وەحی بۆ هێنا؟ وە ئایا ئەم جۆرە زیکرە چۆنە کە فریشتەکان دەیکەن؟ وە ئایا ئەم زیکرە بە پاك دانان و بە گەورە دانان و سوپاس کردنە؟ یان زیکرێکی ترەو لە جۆری زیکرە زانراوەکان نیە؟ وە ئایا ئەوانیش بەردەوامن لەسەر ئەم عیبادەتە، یان بە مردنی پێغەمبەر ﷺ ئەم زیکر کردنەش کۆتایی پێ هات؟

لەوانەیە لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا یەکێك بڵێت: مەبەستی ئەم پیاوە صەڵاوات دانە لەسەر پێغەمبەر ﷺ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾[2]، واتە: (بە ڕاستی خواو فریشتەکانی سەلاوەت لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدەن، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە ئێوەش سەلاوەتی لەسەر لێ بدەن).

لە وەڵامدا دەڵێین: گریمان مەبەستی ئەم پیاوە ئەمەیە، بەڵام ئەمەش هەڵەیە لە هەموو ڕوویەکەوە:

---

(١) سورة التحريم: (٦).

(٢) سورة الأحزاب: (٥٦).

**یەکەم**: ئەم پیاوە کاتێك ئەم قسانەی ووتوە ڕوونی نەکردۆتەوەو مەبەستی قسەکەی دیاری نەکردووە، وە ئەو شوێنەی ئەویش ئەو قسەیەی تیادا کردووە پێویستی بە ڕوون کردنەوە هەیە بە تایبەت یەکێك کە قسەیەکی پڕ لە شیرك و کوفر بکات.

**دووەم**: وە هەروەها کاتیشی بۆ دیاری کردووە کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، وە دەڵێت لە هەموو کاتێکدا، بەڵام ئەو ئایەتەی باسی صەڵاواتی فریشتەکان دەکات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەشێوەیەکی گشتی باسی کردووەو کاتی بۆ دیاری نەکردووە.

**سێیەم**: وە هەروەها صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ زیکرێك نیە بۆ ئەو، بەڵکو دوعاو پاڕانەوەی ئەو کەسەیە لە خوای گەورە کە صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، وە ئەمەش لە شێوەی دوعای ئیماندارە بۆ براکەی، وە ئەمەش لە تایبەتمەندیەکانی پێغەمبەرە ﷺ کە صەڵات و سەلامی لەسەر بدرێت، بە پێچەوانەی هەموو ئیمانداران کە هەندێکیان بۆ هەندێکیان دەپاڕێنەوە بە داواکردنی خێرو چاکەی دونیاو دواڕۆژ.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ پاڕانەوەیە، ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێت: (صەڵاواتم لەسەر بدەن و زۆر دوعا بکەن و بڵێن: اللهم صلِّ على محمد وعلى آل محمد)[1].

وە ئەوەش کە زیاتر ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم پیاوە مەبەستی شتێکی ترە جگە لە صەڵاوات دان، ئەویش ئەو تایبەتمەندیانەیە کەوا بۆ پێغەمبەری ﷺ دانابوو بە پێی ڕاوبۆچونی خۆی، وە هەروەها دانانی ئەو تایبەتمەندیانەی کە تایبەتی خوای گەورەن لە ڕووی پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی و ناوو سیفەتە تەواوو جوانەکانیەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

---

(١) رواه النسائي (٣/٤٩)، صححه الامام الالباني(رحمه الله) في (صحيح سنن النسائي)(١٢٩٢).

وە ئەم قسەیەشی کە دەڵێت: (لـسناك حـين بـدا بـآدم أقبلـت رعيـاً لـسيماك الملائـك تسجد)، چەند سەرپێچیەك لە خۆ دەگرێت، لەوانەش:

ئەم قسەیەی بە درۆ زانینی قورئانی پیرۆزی تیادایە، بەوەی کـە چـەندین ئایـەت هەیـە کە باسی سـوجدە بردنـی فریـشتەکانی تیادایـە، کـە ئەمـەش گوێڕایـەڵی و جـێ بـەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورەیە کاتێك کە فەرمانیان پێ دەکـات بـە سـوجدە بـردن بـۆ ئادەم سـەلامی خـوای لـێ بێـت، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت:﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾[1] ، واتـە: (کاتێـك کە بە فریشتەکانمان وت سـوجدەی ڕێـز بـۆ ئـادەم ببـەن، هـەموویان سـوجدەیان بـرد تەنها ئیبلیس نەبێت پشتی هەڵکردو خۆی بە گەورە زانی، بـەوەش بـوو بـە یـەکێك لـە کـافران)، وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾[2]، واتـە: (خـوای پـەروەردگار بـە فریـشتەکانی فـەرموو: بەڕاستی من کەسێك دروست دەکەم لە قوڕ، وە کە دروستم کردو تەواو بـوو، وە ڕۆحـم بە بـەردا کـرد سـوجدەی ڕێـزی بـۆ ببـەن، فریـشتەکان خۆیـان ئامـادە کـرد بـۆ بـەجێ گەیاندنی فەرمانی خوای گەورەو هەموویان سوجدەیان بۆ برد تەنها ئیبلیس نەبێت کـە خۆی بە گەورە زانی بەسەر ئادەمداو بەم کارەشی خۆی خستە ڕیزی کافرەکانەوە).

وە هەروەها لـە فـەرمودە درێژەکـەی شـەفاعەتدا هـاتووە کـەوا خـەڵکی دەچـن بـۆلای ئادەم سەلامی خوای لێ بێت و پێی دەڵێن: (تـۆ بـاوکی هـەموو مرۆڤـەکانی، وە خـوای گەورە بە دەستی خۆی تۆی دروست کـردووە، وە لـە لایـەن خۆیـەوە ڕۆحـی بـە بـەردا

---

(١) سورة البقرة: (٣٤).

(٢) سورة ص: (٧١– ٧٤).

کردویت، وە فەرمانی بە فریشتەکان کردو ئەوانیش سوجدەیان بۆ بردیت)[1]. کەواتە دەقەکانی قورئان و سوننەت وەك یەك بوون لەسەر ئەوەی کەوا سوجدە بردنی فریشتەکان تەنها بۆ ئادەم بووە سەلامی خوای لێ بێت و جگە لەو بۆ هیچ کەسێکی تر نەبووە.

کەچی قسەکانی ئەم پیاوە پێچەوانەی دەقەکانی قورئان و سوننەت بوون و ئایەت و فەرمودەکان بە درۆ دەزانێت و وا گومان دەبات کەوا ئەم سوجدە بردنە لەبەر خاتری پێغەمبەر بووە ﷺ، لە کاتێکدا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴾[2]، واتە: (کێ لەو کەسە زاڵم و ستەمکارتر هەیە کە درۆ بە ناوی خواوە دەکات و کاتێك حەق و ڕاستیشی بۆ هات بە درۆی دەزانێت و بڕوای پێ ناکات، ئایا تەنها دۆزەخ شوێن و مەئوای کافران نیە؟).

وە بەوەشەوە ناوەستێت و دەڵێت: (کلما لحت للملائك خروا في السموات سجداً وباکیاً)، کە بە ڕاستی ئەمە گەورەترین درۆیەو زیادەڕەوی و ستەم و بوهتانێکی زۆری تیادایە، بەوەی کە فریشتە بەڕێزەکان تاوانبار دەکات بە گەورەترین تاوان لای خوای گەورەو لای پێغەمبەر ﷺو لای ئیمانداران و فریشتە بەڕێزەکان.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴾[3]، واتە: (هەر کەسێك گوناهێکی گەورە ئەنجام بدات یان بچوکتر لەوە، وە پاشان بیداتە پاڵ کەسێکی پاك و بێ تاوان، ئەوا بەڕاستی گوناهو تاوانێکی زۆر گەورەی داوە بە کۆڵی خۆیدا).

(١) صحیح: متفق علیه.
(٢) سورة الزمر: (٣٢).
(٣) سورة النساء: (١١٢).

وە بەسبە بۆ ئەم پیاوە درۆزن و بوهتان کارە کە لێی بپرسین: ئـەم سـوجدە بردنـە بـۆ پێغەمبەر ﷺ لە کوێوە هاتووە؟ ئایا لە وەحی قورئان و سوننەت وەرگیراوە؟ یان لە بیرکردنـەوەو خـەیاڵ وەرگـیراوە؟ یـان لـە وەحـی کـاهن و فاڵـچی و شـەیتانەکانەوە؟ ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمْ يُوحَ إِلَيْهِ شَيْءٌ ﴾[1]، واتـە: (کـێ لەو کەسە زاڵم و سـتەمکارتر هەیـە کـە درۆو بوهتـان بـە نـاوی خـواوە بکـات؟ وە یـان بڵێت: ئەوەم بە وەحی بۆ هاتووەو هیچ وەحیشی بۆ نەهاتبێت؟).

پاشان ئایا کێ فـەرمانی ئـەم سـوجدە بردنـەی کـردووە؟ ئایـا خـوای گـەورە فـەرمانی کـردووە؟ ﴿ قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾[2]، واتـە: (بڵێ: بەڕاستی خوای گەورە فەرمان بەکارو کردەوەی خراپ و بەتاڵ ناکات، ئایا شتێك بەناوی خواوە دەڵێن کە هیچی لێ نازانن؟).

یـان فریـشتە بـەڕێزەکان خۆیـان و بـە بـێ ئیزنـی خـوای گـەورە ئـەم سـوجدەیەیان بردووە؟!! نەخێر بە هیچ شێوەیەك شتی وا نابێت، خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ ﴾[3]، واتـە: (بـەڵکو فریشتەکان عەبدو بەندەی بەڕێزی خوای گەورەن و پێش هیچ وتەیـەکی خـوای گـەورە ناکەون و هەموو ئەمرو فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکەن).

وە لە (ابـن عبـاس)ەوە ڕەزای خـوای لـێ بێـت دەڵێـت: پێغەمبەر ﷺ بـە (جبریـل)ی فەرموو: (ئایا چ شتێك ڕێگریت لێ دەکات کە لەوە زیاتر سەردانمان بکەیت و بێیـت بـۆ لامـان؟ ئـەم ئایەتـە دابەزیـە خـوارەوە: ﴿ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴾، واتە: (ئێمە دانابەزینە خوارەوە تـەنها بـە

---

(١) سورة الأنعام: (٩٣).

(٢) سورة الأعراف: (٢٨).

(٣) سورة الأنبياء: (٢٦ - ٢٧).

ئەمرو فەرمانی خوای گەورە نەبێت، هەموو کردارەکان لەوانەی کە ڕابردوون و لەوانەی ئێستاو ئەوانەش کە لە داهاتوودا دێن هەمووی هەر بە دەستی خوای پەروەردگارە، وە خوای پەروەردگار هیچ شتێکی بیر نەچووە)[١].

کەواتە ئەگەر فریشتەکان نەتوانن بەبێ ئیزن و فەرمانی خوای گەورە تەنها سەردانی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ئەی چۆن دەتوانن سوجدە ببەن و ملکەچی بە گەورە دانان و گریانیان هەبێت بۆی کە بەهیچ شێوەیەك ڕێگەیان پێ نادرێت و بۆ هیچ کەسێکیش ناکرێت جگە لە خوای باڵا دەست؟!

لەوانەیە بوترێت: چۆن سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ پێغەمبەر ﷺ بە شیرك دادەنێن، لە کاتێکدا ئەوان سوجدەیان بۆ ئادەم بردووە سەلامی خوای لێ بێت؟!

لە وەڵامی ئەم شوبهەیەدا دەڵێین: سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ ئادەم سەلامی خوای لێ بێت بریتی بوو لە گوێڕایەڵی کردن و پەرستنی خوای پەروەردگار، وە لە هەمان کاتیشدا سوجدەی ڕێز لێنان بوو لە ئادەم سەلامی خوای لێ بێت.

ابن جرير ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ ئادەم سەلامی خوای لێ بێت ڕێز لێنان بوو بۆی و گوێڕایەڵیش بوو بۆ فەرمانی خوای گەورە، نەك پەرستن بوبێت بۆ ئادەم سەلامی خوای لێ بێت)[٢].

وە هەروەها شیخی ئیسلام ابن تەیمیە ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ ئادەم سەلامی خوای لێ بێت عیبادەت و گوێڕایەڵی بوو بۆ خوای پەروەردگارو هۆکارێك بوو بۆ زیاتر نزیك بوونەوە لێی بەهۆیەوە، وە هەروەها ڕێز لێنان و بە گەورە زانین بوو بۆ ئادەم سەلامی خوای لێ بێت)[٣].

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٨/٤٢٨)، والآية من سورة مريم: (٦٤).

(٢) تفسير ابن جرير (١/٥١٢).

(٣) مجموع الفتاوى (٤/٤٦٠).

وە هەروەها شتێكی تریش كە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە سوجدە بردنی فریشتەكان بۆ ئادەم سەلامی خـوای لـێ بێت تـەنها سـوجدەی ڕێـز لێنـان بـووەو بـەس، بەڵگەكـەی (ابلیس)ی لەعنـەت لێكـراوە كـە بـە هۆیـەوە سـوجدەی بـۆ ئـادەم نـەبرد، كـە ووتـی: ﴿ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا﴾[1]، واتە: (ئایا من سوجدە ببەم بۆ كەسێك كە تۆ لە قوڕ دروستت كردووە؟ پاشان كە ئیبلیس زانی خوای گەورە فەزڵی ئادەمی داوە بەسەر ئەودا، وتی: ئایا دەتەوێت من مل كەچ بكەم و سوجدە ببەم بۆ ئەو كەسەی كە ڕێزیت داوە بەسەر منـدا؟ ئەگـەر مۆڵـەتم بـدەیت و بمهێڵیتـەوە تـا ڕۆژی قیامـەت ئـەوا هەموو نەوەكانی گومڕاو سەر شێواو دەكەم تەنها كەمێكیان نەبن).

كەواتە پاش ئەوەی كە ڕوون بۆوە سوجدە بردنی فریشتەكان بۆ ئادەم سەلامی خـوای لێ بێت تەنها بۆ ڕێز لێنـان بـووە، وە هـەروەها بـە ئیـزن و فـەرمانی خـوای گـەورەش بووە" ئەوا بەڕاستی قیاس كردنی جگە لە ئادەم سـەلامی خـوای لـێ بێـت بـە سـوجدە بردنی فریشتەكان بۆی شیرك و هاوەڵ دانانـە بـۆ خـوای گـەورە لـە شـەریعەت داناندا، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾[2]، واتە: (ئایا ئەو هاوبەش دانەرانـە هـیچ هـاوەڵ و هاوبەشـێكیان هەیـە كـە ئـەو شـیرك و بیدعەیەیان هێناوەتە ئاراوەو خوای گەورەش ئیزنی پێ نەداون؟ وە ئەگەر ئـەو بەڵێنـە نەبوایە كە خوای گەورە داویـەتی بـەوەی كـە سـزایان دوا بخـات ئـەوا هـەر لـە دونیـادا خـوای گـەورە سـزای دەدان، وە بەڕاسـتی عـەزاب و سـزایەكی زۆر تونـدو بـە ئـازار چاوەڕێی زاڵم و ستەم كارەكان دەكات).

---

(١) سورة الإسراء: (٦١ – ٦٢).

(٢) سورة الشورى: (٢١).

وە هەر کەسێکیش سوجدە بردنی فریشتەکان بۆ غەیری ئادەم سەلامی خوای لیٚ بێت بە دروست دابنێت بە قیاس کردنی بۆ سەر ئادەم، ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە خۆی بە دانەری شەرع داناوە لەگەڵ خوای گەورەدا، وە ئەمەش خودی شیرك و کوفرو گومڕاییەکەیە.

وە هەروەها لە لایەکی تریشەوە ئەم پیاوە تەنها بە سوجدە بردنی فریشتەکان نەوەستاوە، بەڵکو دەڵێت سوجدە بردنەکەیان بە گریانیشەوە بووە، وە ئەمەش شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە مەبەستی ئەم پیاوە تەنها بریتی نیە لە ڕێز لێنان و سەلام کردن، بەڵکو ئەمە سوجدە بردنێکە تەنها بۆ عیبادەت و پەرستنێکی پاك و تەواو دەبرێت، وە دروست نیە بۆ هیچ کەسێکیش بکرێت تەنها بۆ خوای پەروەردگار نەبێت.

وە خوای پەروەردگار فریشتە بەڕێزەکانی پاراستووە لەوەی کە هاوبەشی بۆ دابنێن لەهەر جۆرێك لە جۆرەکانی هاوبەش دانان، نەك هەر ئەوەش بەڵکو پارێزراون لە هەموو گوناهێك، وە ئەوان تاوانی بچوك ئەنجام نادەن ئەی چۆن تاوانی بە هیلاك دەرو گەورەترینی تاوانە گەورەکان ئەنجام دەدەن؟

وە هەرەوها دەربارەی ئەو بوهتان و درۆیەی کە بە ناوی (جبریل)ەوە سەلامی خوای لیٚ بێت دەیکات کە گوایا بەم شێوەیە سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کردووە: (السلام عليك يا أول، السلام عليك يا آخر، السلام عليك يا باطن، السلام عليك يا ظاهر)، کە بەڕاستی ئەمە بوهتانێکی گەورەیە لەو بوهتانانەی کە بۆ فریشتە بەڕێزەکانی خوای گەورە دەیکات، وە ئەم کوفرو لادانەش لە ناوە جوانەکانی خوای پەروەردگاردا دوورە لە (جبريل الأمين) سەلامی خوای لیٚ بێت.

وە لە هەموو ئەو فەرمودە پیرۆزانەی لەبەر دەست دان، هیچ فەرمودەیەکی صەحیح یان ضەعیف تەنانەت مەوضوعیش نیە کە باس لەم جۆرە قسانە بکات کەوا جبریل سەلامی خوای لیٚ بێت لە کاتی گفتوگۆ کردنی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ ئاوای وتبێت، بەڵکو زۆربەی بانگ کردن و گفتوگۆکانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بە (یامحمد) بووە، وە هەندیٚ جاریش وتویەتی (یا رسول الله).

وە تۆش بۆت هەیە كە بپرسیت: ئایا بۆچی (جبریـل)ی سـەلامی خـوای لـێ بێـت لـەناو فریشتەكاندا تایبەت كردووە بەم كوفرو شیرك و گومڕاییە؟

ئایا لەبەر ئەوەیە كە جبریل سەلامی خوای لـێ بێـت عـەزاب دادەبـەزێنێت؟! هـەروەك جولەكەكان هۆكاری كافر بوونی خۆیانیان بە پێغەمبەر ﷺ بەوە دادەناو دەیـان ووت: ئەگەر فریـشتەیەكی تـر وەحـی بـۆ تـۆ دابـەزێنێت ئـەوا بـاوەڕت پـێ دەهێـنین، خـوای گـەورەش ئـەم ئایەتـەی دابەزانـد بەسـەریاندا كـە دەفـەرموێت: ﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَرُسُلِهِ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَالَ فَإِنَّ اللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَافِرِينَ ﴾[1]، واتە: (بەو جولەكانە بلێ كە دەڵێن بۆیە ئیمان ناهێنین چونكە جبریل وەحی بۆ تۆ دەهینێت وە دوژمنایەتی (جبریل) دەكەن ئەوە خوای گەورە فەرمانی پێ كـردووە كـە بەسـەر تـۆدا قورئـان دابـەزێنێت، وە بەڕاسـت دانـەری كتێبـەكانی پـێش خۆیـشیەتی كـە(تـەورات و ئینجیـل)ن، وە هـەروەها هیدایـەت و ڕێنومـویی و مـژدەی تیادایە بۆ ئیمانـداران، وە هـەر كەسـێكیش دوژمنایـەتی خـوای گـەورەو فریـشتەكان و پێغەمبەرانی و جبریل و میكال بكات، ئەوا بەڕاسـتی خـوای گـەورە دوژمنـی كـافرو بـێ باوەڕەكانە).

وە یەكسان و وەك یەكە كە هۆكارەكە ئەمە بێت یان جگە لەمە، چونكە بەڕاستی ئـەم دوو كۆمەڵە دژایەتی و دوژمنایەتیان بۆ جبریل سەلامی خوای لێ بێـت وەك یـەك وایـەو لـە یـەك دەچـن، بـەڵكو تەنانەت دوژمنایـەتی و دژایـەتی ئـەم پیـاوە زۆر تونـدترو ستەمكارانەترو گەورەترە لە هی ئەوان خوای گەورە پەنامان بدات.

(١) سورة البقرة: (٩٧ – ٩٨).

# بەندی چوارەم:

بەشی یەکەم

خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ.

بەشی دووەم

زیادەڕەوی کردن لە پیاو چاکاندا.

بەشی سێیەم

خستنە ڕووی شوبهەکان.

بەشی چوارەم

بە گەورە دانانی پێغەمبەر ﷺ دەبێت چۆن بێت؟

بەشی پێنجەم

خوای گەورە بۆ هەموو شتێك ئەندازەی داناوە.

بەشی شەشەم

بۆچی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی زیادەڕەوی دەکەن لە وەصفی پێغەمبەردا ﷺ؟

# بەشی یەکەم:

# خۆشویستنی پێغەمبەر 

زۆرن ئەوانەی بانگەشەی خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ دەکەن و واش دەردەبڕن کە ئەوان لە پێش هەموو کەسەوەن و زۆر زیاتر لە خەڵکی تر پێغەمبەریان ﷺ خۆش دەوێت، وە یەکەم کەسانێك کە لەلای خۆیانەوە شانازیان بەم بانگەشە کردنە کردووە شیعەکان بوون، کە بانگەشەیان بۆ خۆشویستن و بە گەورە دانانی پێغەمبەر ﷺ و ئال و بەیتەکەی دەکرد، تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە کۆمەڵێکیان (علي کوڕی أبوطالب)یان بە خوا دەزانی، ئەویش بە ئاگر سوتاندنی.

وە ئەمانە خۆشویستنەکەیان کورت هەڵهێنابوو تەنها بۆ ئال و بەیتەکەی جگە لە خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ کە ئەمەیان کرۆك و بنچینەکەیەو ئەوانی تر لاوەکین، چونکە دەبێت خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ بنچینەکە بێت و ئنجا خێزان و ئال و بەیتەکەی و هاوەڵە بەڕێزەکانی ڕەزای خوایان لێ بێت.

پاشان لە نێوان ئەم کۆمەڵانەدا کۆمەڵی تەصەوف سەری هەڵدا، کە تێکەڵاو کراوی چەندین بیرو بۆچونی جیاوازە، وە ئەم تەریقەتە لەسەر ئەوە دروست بووە کە گوایا بانگەشەی خۆشویستنی خوای گەورە دەکەن و فەنا دەبن تیایدا، وە لەوەشدا زیادەڕەویەکی زۆریان کرد تا گەیشتە ئەو ئاستەی کە باسی (وحدة الوجود والحلول والإتحاد)[1] بکەن، وە هەروەها بانگەشەیان بۆ خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ دەکردو بە

---

(١) ئەمەش بیروباوەڕی زۆرێك لە صۆفیەکانەو پێشەوایان لەمەدا ابن عربی صۆفیە کە لە دیمەشق نێژراوەو پێیان وایە کە خوا تواوەتەوە لەناو دروست کراوەکانیداو خوا هەموو شتێکەو هەموو شتێکیش خوایە، پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی کە ئەوان دەیڵێن و بڕوایان پێیەتی، وە ئەمەش لەسەر زمانی زۆربەی پێشەواکانیان دەردەبڕدرێت، بۆ نمونە ابن عربی دەڵێت:

العبد ربٌّ، والربَّ عبدٌ        يا ليت شعري مَن المكلف؟

وە هەروەها شاعیرێکی صۆفی تر کە هەمان بیرو باوەڕی گومڕی هەیە دەڵێت:

وما الكلب والخنزير إلاّ إلهنا        وما الله إلاّ راهبٌ في كنيسة

پاکو بێگەردی بۆ خوای گەورەو پەنا بە خوای گەورە لەوەی کە ئەمان دەیڵێن. لە کتێبی (منهاج الفرقة الناجية) لاپەڕە (٥٩-٦٠) وەرگیراوە.

گـەورەیان دادەنـاو خۆشەویـستیان بـۆ ئـال و بەیتەکـەی دەردەبـڕی و زیادەڕەویـەکی زۆریان لەو بوارەدا کرد تا گەیشتە ئاستی ئەو زیادەڕەویەی کە گاورەکان لـە بەرامبـەر عیسی سەلامی خوای لیّ بێت کردیان.

وە ئوممەتی ئیسلامی توشی هیچ بەڵایەك نەبوو کە گەورەتر بێت لـە هـی ئـەم کۆمەڵـە گومڕایە، چونکە هیچ بنچینەیەکی ئەم دینـە نیـە کـە ئـەوان هـەڵیان نەوەشاندبێتەوە، هـەر لـە بەتـەنها زانـینی خـوای گـەورەوە بیگـرە لـە پەرسـتن و عیبـادەت بـۆکردن و پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی و نـاوە جوانەکانیـدا تـا دەگاتـە ئەوپـەڕی بنـچینەکانی تری ئەم ئایینە تەواوو بیّ کەمو کووڕیە.

وە لەناو گەلانی پێشودا بانگەشەی لـەم شـێوازە کـراوەو هـەبووە، وەك گاورەکـان کـە بانگەشەی خۆشویستنی (عیسی)یان دەکـرد سـەلامی خـوای لـیّ بێـت و بـە گـەورەیان دەزانی و زیادەڕەویەکی زۆریان تیادا کرد تـا گەیـشتە ئـەو ئاسـتەی کـە بڵـێن: عیسی کوڕی خوایە، یان هەر خۆی بە تەنها خوایە، یان سێیەمینی خوایەکانە، پاکو بێگـەردی بۆ خوای باڵا دەست لەم زیادەڕەویانە.

وە هەروەها یەهودیەکانیش (جولەکەکان) بانگەشەیان دەکرد بۆ خۆشویستنی (عزیـر) سەلامی خوای لیّ بێت و زیادەڕەویەکی زۆریان کرد تیایداو دەیـان وت: عـوزەیر کـوڕی خوایە، بەڵام خوای باڵا دەست بانگەشەکەیانی بە درۆ خـستەوەو لەعنـەتی لـیّ کـردن، وە دەربارەیان فـەرمووی: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾[1] واتـە: (جولەکـەکان دەیـان وت: (عـوزەیر) گاورەکـانیش دەیـان وت: (عیـسا) کـوڕی خوایـە، وە ئەمـەش تـەنها قـسەیەکەو هـیچ بەڵگەیەکیان پیّ نیە لەسـەری، ئەمـەش هـەروەك قـسەی موشـریکە کۆنـەکان وایـە کـە

(١) سورة التوبة: (٣٠).

گـەورەیان دادەنـاو خۆشەویـستیان بـۆ ئـال و بەیتەکـەی دەردەبـڕی و زیادەڕەویـەکی زۆریان لەو بوارەدا کرد تا گەیشتە ئاستی ئەو زیادەڕەویەی کە گاورەکان لـە بەرامبـەر عیسی سەلامی خوای لێ بێت کردیان.

وە ئوممەتی ئیسلامی توشی هیچ بەڵایەك نەبوو کە گەورەتر بێت لـە هـی ئـەم کۆمەڵـە گومڕایە، چونکە هیچ بنچینەیەکی ئەم دینـە نیـە کـە ئـەوان هـەڵیان نەوەشاندبێتەوە، هـەر لـە بەتـەنها زانـینی خـوای گـەورەوە بیگـرە لـە پەرسـتن و عیبـادەت بـۆکردن و پەرستراوێتی و پەروەردگارێتی و نـاوە جوانەکانیـدا تـا دەگاتـە ئەوپـەڕی بنـچینەکانی تری ئەم ئایینە تەواوو بێ کەمو کووڕیە.

وە لەناو گەلانی پێشودا بانگەشەی لـەم شێوازە کـراوەو هـەبووە، وەك گاورەکـان کـە بانگەشەی خۆشویستنی (عیسی)یان دەکـرد سـەلامی خـوای لـێ بێـت و بـە گـەورەیان دەزانی و زیادەڕەویەکی زۆریان تیادا کرد تـا گەیـشتە ئـەو ئاسـتەی کـە بڵـێن: عیـسی کوڕی خوایە، یان هەر خۆی بە تەنها خوایە، یان سێیەمینی خوایەکانە، پاکو بێگـەردی بۆ خوای باڵا دەست لەم زیادەڕەویانە.

وە هەروەها یەهودیەکانیش (جولەکەکان) بانگەشەیان دەکرد بۆ خۆشویستنی (عزیـر) سەلامی خوای لێ بێت و زیادەڕەویەکی زۆریان کرد تیایداو دەیـان وت: عـوزەیر کـوڕی خوایە، بەڵام خوای باڵا دەست بانگەشەکەیانی بە درۆ خـستەوەو لەعنـەتی لـێ کـردن، وە دەربارەیان فـەرمووی: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾[1] واتـە: (جولەکـەکان دەیـان وت: (عـوزەیر) گاورەکـانیش دەیـان وت: (عیـسا) کـوڕی خوایـە، وە ئەمـەش تـەنها قـسەیەکەو هـیچ بەڵگەیەکیان پێ نیە لەسەری، ئەمـەش هـەروەك قـسەی موشـریکە کۆنـەکان وایـە کـە

(١) سورة التوبة: (٣٠).

دەیان وت: فریشتەکان کچی خوان، خوای گەورە بیـان کوژێت و لـەناویان بـەرێت و لەعنەتیان لێبێت لەسەر ئەو درۆو بوهتانەی کە دەیکەن).

وە هـەروەها فـەرمووی: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾[1] (بەڕاستی ئەوانە کافر بوون کـە دەیـان وت: خـوا مەسیحی کـوڕی مەریەمە!).

وە هـەروەها فەرمووی: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[2]، واتە: (بەڕاستی کافر بوون ئەوانەی کە دەیـان وت: سـێ خـوا هـەن (اللّٰه، و عیسی، و مریم)، پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی کە ئەو موشریکانە دەیڵـێن، وە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لـە (اللّٰه)، وە ئەگـەر واز نـەهێنن لـەو شـتانەی کـە دەیڵێن، ئەوا بەڕاستی ئەوانەی کافر بوون توشی سـزاو عـەزابێکی زۆر تونـدو بـە ئـێش دەبن).

وە خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنی تـری قورئـانی پـیرۆزدا باسـی زیـادەڕەوی ئـەهلی کیتابی کردووە لە بەرامبەر پێغەمبەران و پیاو چاکاندا، وە بە تایبەتی گاورەکان کە لە هـەموو کـەس زیـاتر زیادەڕەویـان کـردووە لـە پێغەمبـەران و پیـاو چـاکاندا، وە جگـە لەوانیش ئەم بانگەشەی خۆشویستن و زیادەڕەوی کردنە جگە لە گاورو یەهودیەکانیش دەرکەوتووە، وەك صابیئەو مەجوس و ئەستێرە پەرست و موشریکە عەرەبەکان و بـت پەرسـتەکان و جگـە لـەوانیش کـە زیادەڕەویـان کـردووە لـە فریـشتەو پیـاو چـاکاندا، هەروەك خوای گەورە لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا ئاماژەیان پێ دەکات، لەوانەش:

---

(١) سورة المائدة: (١٧).

(٢) سورة المائدة: (٧٣).

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴾[1]،واتە: (وە موشریكەكان دەیان وت: خـوا منـداڵی هەیـەو فریشتەكان كچی ئەون، پـاكو بێگـەردی بـۆ خـوای گـەورە لـەوەی كـە ئـەوان دەیڵـێن، بـەڵكو ئـەو فریشتانە عەبدو بەندەی بەڕێزی خوای گەورەن).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴾[2]، واتـە: (موشریكەكان منداڵیان بۆ خوای گەورە بڕیار دەداو دەیان وت فریشتەكان كچی خوان، پاكو بێگەردی بۆ خوای گـەورە لـەوەی كـە ئـەوان دەیڵـێن، وە منـداڵی كوڕیشیان بـۆ خۆیان دادەنا كە خۆیان حەزیان لێ بوو).

وە هـــــەروەها دەفـــــەرموێت: ﴿ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾[3]، واتـە: (موشـریكە بـت پەرسـتەكان دەیـان وت فریشتەكان كچی خوان و جنۆكەش دایكی فریشتەكانن، وە جنۆكەكان باش دەزانن كـە ئـەوانیش لـە ڕۆژی دواییـدا زینـدوو دەكرێنـەوە، پـاكو بێگـەردی بـۆ ئـەو خوایـەی كـە موشریكەكان ئاوا وەصفی دەكەن).

وە هەموو ئەوانەش كە زیادەڕەویان كرد لە فریشتەو پیـاو چاكاندا دەیان پەرستن و دەیان كردن بە شەفاعەتكارو واسیتەو تەوەسولیان پێ دەكـردن بـۆ ئـەوەی لـە خـوای گەورەیان نزیك بخەنەوە، هەروەك خوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ ﴾[4]، واتـە: (ئەوانـەی كـە غـەیری خوای گەورەیان دەكرد بە شەفاعەتكار دەیان وت: خۆ ئێمە نایان پەرستین بـەڵكو بـۆ ئەوەیە كە لە خوامان نزیك بخەنەوە).

---

(١) سورة الأنبياء: (٢٦).

(٢) سورة النحل: (٥٧).

(٣) سورة الصافات: (١٥٨- ١٥٩).

(٤) سورة الزمر: (٣).

وە خوای پەروەردگاریش دەعواو بانگەشەکەیانی بەتاڵ کردەوەو هەڵی وەشاندەوە لە هەموو ڕوویەکەوە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ اتَّخَذَ الرَّحْمَنُ وَلَدًا سُبْحَانَهُ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴾.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَجَعَلُوا الْمَلَائِكَةَ الَّذِينَ هُمْ عِبَادُ الرَّحْمَنِ إِنَاثًا أَشَهِدُوا خَلْقَهُمْ سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ وَقَالُوا لَوْ شَاءَ الرَّحْمَنُ مَا عَبَدْنَاهُم مَّا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴾[1]، واتە: (موشریکەکان ئەو فریشتانەی کە بەندەی خوای گەورەن بە کچ دادەنێن و دەڵێن: کچی خوان!! وە ئایا ئەوان ئاگادار بوون کاتێك کە خوای گەورە دروستی کردن تا ئەوە بزانن؟ وە بەڕاستی ئەو شاهێدی دانەیان لەسەر دەنوسرێت و لەسەری لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرێت، پاشان دەڵێن: ئەگەر خوا بیویستایە ئەوا ئێمە ئەوانمان نەدەپەرست، وە بۆ ئەو کارەشیان هیچ بەڵگەیەکیان پێ نیەو تەنها شوێن درۆی خۆیان کەوتون).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴾[2]، واتە: (ئەوە عیسای کوڕی مەریەمە کە ئەو وەصفانەی بۆ کراوە، وە هەر ئەوەش قسەی حەقە نەك ئەوەی ئەوان دەیلێن و گومانی بۆ دەبەن، وە منداڵ دانان بۆ خوای گەورە شایانی ئەو نیەو ئەو لەو پەڕی سیفەتی تەواو دایەو پاکو بێگەردی بۆ ئەو دەربارەی ئەوەی کە ئەوان دەیلێن، وە ئەگەر خوای گەورە هەر کارێکی بوێت ئەوا دەڵێت ببە ئەویش دەبێت).

وە هەروەها لە چەندەها شوێنی قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە خوای گەورە نەفی پەرستراوێتی کردووە لە هەموو کەسێکدا جگە لە زاتی خۆی نەبێت، وەك دەفەرموێت:

---

(١) سورة الزخرف: (١٩ - ٢٠).

(٢) سورة مريم: (٣٤-٣٥).

﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴾[1]، واتە: (بەڕاستی پەرستراوی ئێوە تاك وتەنهایە، وە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لەو نەبێت کە خوایەکی زۆر بە بەزەیی و بەخشندەیە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾[2]، واتە: (هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە (الله)، وە بەڕاستی خوای گەورە زۆر بە دەسەڵات و کار بەجێیە).

وە هەروەها دەربارەی بانگەوازی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت دەفەرموێت: ﴿ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ﴾[3]، واتە: (بە تەنها خوای گەورە بپەرستن، چونکە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تری بە حەق نیە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾[4]، واتە: (بەڕاستی ئەوانە کافر بوون کە دەیان وت: مەسیحی کوڕی مەریەم خوایە! وە مەسیح دەی وت: ئەی بەنی ئیسرائیل تەنها ئەو خوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و ئێوەیە، بەڕاستی هەر کەسێك شەریك و هاوەڵ بۆ خوای گەورە دابنێت، ئەوا خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات و مەئواو شوێنی ئەو کەسەش ناو ئاگری دۆزەخە، وە کەسی زاڵم و ستەمکارو موشریك هیچ سەرخەرێکی نیە).

---

(١) سورة البقرة: (١٦٣).

(٢) سورة آل عمران: (٦٢).

(٣) سورة الأعراف: (٥٩،٧٣،٦٥).

(٤) سورة المائدة: (٧٢).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾[1]، واتە: (وە عیسا سەلامی خوای لێ بێت تەنها پێغەمبەرێکە کە خوای گەورە ناردوویەتی و لە پێش ئەویشدا پێغەمبەرانێکی زۆر هاتوون، وە دایکیشی ئافرەتێکی تەواو ڕاستگۆو داوێن پاکە کە ئەوەش پلەو پایەیەکی زۆر بەرزە کە خوای گەورە پێی بەخشیوە، کەوایە مادام هەردوکیان مرۆڤن ئەی چۆن دەیان کەن بە دوو خوا لەگەڵ خوای گەورەو پاك و تاك و تەنها؟ وە ئەوان خواردن دەخۆن کە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە ئەوان دوو بەندەی لاوازی خوای گەورەن و وەك هەموو بەندەکانی تر پێویستیان بە خواردن و خواردنەوە هەیە، سەیرکە چۆن حەق و بەڵگەکانی خۆمانیان بۆ ڕوون دەکەینەوە کەچی ئەوان هەر سەرکەشی دەنوێنن و واز ناهێنن لەو درۆو بوهتانەی کە باسی دەکەن).

وە هەروەها جێی ئاماژە پێ کردنە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕەددە لەسەر دوو کۆمەڵی جیاواز ئەوانیش:

**یەکەمیان:** ئەوانەن کە زیادە ڕەویان کرد لە بە گەورە دانانی عیسی و دایکیدا سەلامی خوایان لێ بێت کە کردیانن بە خوا لەگەڵ خوای تاك و تەنهاو باڵا دەستدا، کە ئەوانیش گاورەکان بوون.

**دووەمیان:** ئەوانەن کەوا ئەزیەت و ئازاری (عیسی)یان دەداو بەدرۆیان دەزانی و دەیان ویست کە بیکوژن و لە خاچی بدەن و ئەزیەت و ئازاری دایکیان دەداو بوهتانیان بۆ دەکرد، کە ئەمانەش یەهودیەکان بوون.

وەك دەفەرموێت: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ﴾، واتە: (عیسی نە خوایەو نە کوڕی خواشە، هەروەك گاورەکان وا

---

(١) المائدة: (٧٥).

گومانیـان دەبـردو زیادەڕەویـان دەكـرد، وە هـەروەها درۆش بـە نـاوی خـواوە ناكـات هەروەك یەهودیەكان وا گومانیان دەبردو زیادەڕەویـان دەكـرد، وە وەصـفی دایكیـشی دەكات بەوەی كە ڕاستگۆیە، ئەمەش ڕەددە لەسەر هەردوو كۆمەڵەكە كە زیادەڕەویان كرد).

وەك پێـشتر باسمـان کـردو بۆمـان ڕوون بـۆوە، کـە سـەرەتای سـەرهەڵدان و زیادەڕەوی کردن لە پیاوچاکاندا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی قەومی نوح سەلامی خـوای لێ بێت، کە زیادەڕەوویان کرد لە خۆشویستن و بە گەورە دانانی (ود و سواع و یغـوث و یعوق و نسر)دا، وە پاشـان ئـەم زیادەڕەویـە بـەردەوام بـوو تـا زۆربـەی سـەر ڕووی زەوی گرتەوە.

وە هەر لەوەشەوە بۆمـان ڕوون بـۆوە کـە زیـادەڕەوی کـردن لـە حـەقی پێغەمبـەران و فریشتەو پیاو چاکاندا بنچینەی شیرك و گومڕایی بوو لەناو ئوممەتانی پێشودا، وە هەر لەبەر ئەمەشە کە خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزو پێغەمبەریش ﷺ لـە فـەرمودە صەحیحەکانیدا ئاماژەیان بەمە داوەو وریایان کردوینەتـەوە کـە خۆمـان بپـارێزین لـەم کارانەو هەموو ئەم کارانەش کە سەر دەکێشن بۆ ئەم زیادەڕەوی و هاوبەش دانانـە بـۆ خوای پەروەردگار.

وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ﴾[1]، واتـە: (ئـەی ئـەهلی کیتـاب (جولەکـەو گاورەکـان) زیادەڕەوی لە دینەکەتاندا مەکەن، وە هـیچ شـتێك لەسـەر خـوای گـەورە مـەڵێن تـەنها حەق نەبێت).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾[2]، واتـە: (ئـەی ئـەهلی کیتـاب (جولەکـەو گاورەکـان) زیـادەڕەوی لـە دینەکەتانـدا مەکـەن و تـەنها شـوێن حـەق بکـەون، وە شـوێن هـەواو ئـارەزوی ئەوانـە

(١) سورة النساء: (١٧١).

(٢) سورة المائدة: (٧٧).

مەكەون كە لە پێشودا گومڕابوون، وە خەڵكانێكی زۆریان گومڕا كـردو لاڕێیـان كـردن و لە ڕێگای ڕاست لایان دان).

وە هەروەها خوای گەورە وەصفی عیسی و هەموو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت دەكـات بـەوەی كـە هـەموویان مـرۆڤن و خـواردن دەخـۆن و دەخۆنـەوەو دەڕۆن و ژن دەهێنن و منداڵیان دەبێت و پیر دەبن و لاواز دەبن و نەخۆش دەكەون، كەوابوو توشـی هەموو ئەم شـتانە دەبـن كـە مرۆڤـی ئاسـایی توشـی دەبێـت، وە هـەروەها وەصـفیان دەكات بەوەی كە ئەوانیش عیبادەت بۆ خوای گـەورە دەكـەن و پـەرستنی بـۆ ئـەنجام دەدەن، ئەمەش لە زۆر ئایەتی قورئاندا خوای گەورە باسی كردووە، لەوانەش:

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾[1]، واتـە: (عیـسا ئـەوە بـە كـەم نازانێـت كـە بەندەیـەكی خـوای گەورەیە، وە هەروەها فریشتە نزیكەكانیش بە هەمان شێوە، وە هـەر كەسێكیش ئـەو بەندایەتی كردنـە بـۆ خـوای گـەورە بـە كـەم بزانێـت و خـۆی بـە گـەورە بزانێـت، ئـەوا بەڕاستی هەر هەموو خەڵكی بـە كـافرو خـۆ بـە گـەورەزان و ئیمانداراانەوە بـە یەكـەوە حەشر دەكەین، بەڵام ئەوانـەی كـە ئیمانـدارن و كـردەوەی چـاكیان ئـەنجام داوە ئـەوا پاداشـتیان دەدەینـەوەو فـەزڵ و بەخشـشی خۆمانیـانی بەسـەردا زیـاد دەكـەین، وە ئەوانەش كە بەندایـەتی كردنـی خـوای گـەورەیان بـە كـەم زانیـوەو خۆیـان بـە گـەورە دەزانی ئەوا عەزاب و سزایەكی زۆر توندو بە ئێشیان دەدەیـن، وە لـەو ڕۆژەشـدا هـیچ

(١) سورة النساء: (١٧٢ - ١٧٣).

کەسێکیان دەست ناکەوێت جگە لـە خـوای گـەورە کـە پـشتیوانیان بێـت و لـەو سـزایە ڕزگاریان بکات).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ﴾[1]، واتـە: (بەڕاسـتی ئەی پێغەمبەر بە وەحی بۆ تـۆ هـاتووە وە بـۆ پێغەمبـەرانی پـێش تـۆیش، کـە ئەگـەر هاوەڵ بۆ خوا دابنێیـت ئـەوا بەڕاسـتی هـەموو کردەوەکانـت هـەڵ دەوەشـێنەوەو لـەو کەسـانە دەبیـت کـە خەسـارەت مەنـدو زەرەرمەنـدن، بـەڵکو بـە تـەنها خـوای گـەورە بپەرستەو لە ڕیزی ئەو کەسانە بە کە سوپاس گوزارن).

وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ الْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ لَّوْلَا أَن تَدَارَكَهُ نِعْمَةٌ مِّن رَّبِّهِ لَنُبِذَ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ مَذْمُومٌ فَاجْتَبَاهُ رَبُّهُ فَجَعَلَهُ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾[2]، واتـە: (صەبرو ئارامت هەبێت لەسەر حوکم و قـەدەری خـوای گـەورەو وەك یـونس مەکـە کـە توشی ئەوەبوو وازی لە قەومەکەی هێناو کەوتە ناوسکی حوتەکـەوەو لەوێـشدا لۆمـەی نەفسی خۆی دەکردو پاشان خوای گەورە سۆزو بەزەیی خۆی بەسەردا ڕژاندو ڕزگـاری کرد لەوەی کە حوتەکە فڕێی بداتە زەویەکی وشك و بێ دەرامەتـەوە، وە هـەڵی بـژاردو کردی بە یەکێك لە پیاو چاکان).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّي وَآتَانِي مِنْهُ رَحْمَةً فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ اللَّهِ إِنْ عَصَيْتُهُ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيْرَ تَخْسِيرٍ ﴾[3]، واتـــە: (ئـــەی قەومەکەم: ئایا نابینن کە من لەسەر بەرنامەیـەکی ڕوون و ئاشـکرام کـە خـوای گـەورە بۆی ناردووم، وە هەروەها ڕەحمەت و سۆزو بەزەیی خۆی پێـی بەخـشیوم؟ وە ئەگـەر

---

(١) سورة الزمر: (٦٥ — ٦٦).

(٢) سورة القلم: (٤٨ - ٥٠).

(٣) سورة هود: (٦٣).

بێتوو سەرپێچی فەرمانەکانی بکەم کێ سەرم دەخات جگە لەو؟ وە ئێوەش جگە لە زەرەرمەندی و خەسارەت مەندی هیچی ترم بۆ زیاد ناکەن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَـٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَـٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ فَٱحْكُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلْهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۢ بِمَا نَسُوا۟ يَوْمَ ٱلْحِسَابِ ﴾[1]، واتە: (ئەی داود: ئێمە تۆمان کردووە بە خەلیفە لەسەر زەویداو حوکم لە نێوان خەڵکیدا بکە بە حەق و شوێن هەواو ئارەزوەکان مەکەوە بە هۆی نزیکی و خزمایەتیەوە، چونکە بەڕاستی ئەو هەواو ئارەزووە لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە لات دەدات، وە بەڕاستی ئەوانەی لە ڕێگای ڕاستی خوای گەورە لادەدەن ئەوا توشی سزایەکی زۆر توند دەبن، لەبەر ئەوەی کەوا حیساب و لێ پرسینەوەی ڕۆژی دوایی بیر چۆتەوە).

وە هەروەها ئایەت دەربارەی پێغەمبەر ﷺ زۆرن لەوانەش:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾[2]، واتە: (ئەی پێغەمبەر: ئەوەی کە لەلایەن خواوە بۆت هاتووە ڕای بگەیەنە، وە ئەگەر ئەمە نەکەیت" ئەوا بەڕاستی پەیامی خوای گەورەت ڕانەگەیاندووە، وە خوای گەورە دەت پارێزێت لە شەڕی خەڵکی، وە بەڕاستی خوای گەورە کافران هیدایەت نادات).

ابن جریر دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێت: (خوای گەورە فێری دەکات و ئاگاداری دەکاتەوە کە ئەگەر بێت و کەمتەرخەمی بکات لە ڕاگەیاندنی بەشێك لەوەی کە بەسەریدا دابەزیوە، ئەوا بەڕاستی وازی لە گەیاندن و ڕاگەیاندنی هێناوە)[3].

(١) سورة ص: (٢٦).

(٢) سورة المائدة: (٦٧).

(٣) تفسير الطبري (١٠/٤٦٧).

وە هەروەها القرطبي لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: (ئەوە پەروەردە کردنە بۆ پێغەمبەر ﷺو زانایان و هەڵگرانی زانست و زانیاری لەناو ئوممەتەکەیاندا کە هیچ شتێك لە شەریعەتەکەی نەشارنەوە، وە خوای پەروەردگار ئاگادارە بەوەی کە پێغەمبەرەکەی ﷺ هیچ شتێك لە وەحی خوای گەورە ناشارێتەوە)[1].

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾[2]، واتە: (بڵێ: بەڕاستی من لە سزاو عەزابی ڕۆژێکی زۆر گەورە دەترسم لەوەی کە سەرپێچی فەرمانی خوای گەورە بکەم و هاوەڵی بۆ دابنێم).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴾[3]، واتە: (لەگەڵ خوای گەورە هاوار مەکە هیچ پەستراوێکی تر، چونکە ئەگەر ئەوە بکەیت ئەوا تۆ لەو کەسانە دەبیت کە سزا دەدرێن).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾[4]، واتە: (هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە لە شەڕدا دیل بگریت تا زۆر بە توندی هێرشیان نەکردبێتە سەر دوژمن و زۆریان لێ نەکوشتبن، وە ئێوە دونیای بێ بایەختان دەوێت بەڵام خوای گەورە دواڕۆژی دەوێت، وە خوای گەورە زۆر بە دەسەڵات و کار بەجێیە، وە ئەگەر خوای گەورە تەقدیری لەسەر ئەوە نەبوایە کە بۆی نوسیون ئەوە بەڕاستی توشی سزایەکی زۆر توندو بە ئێش دەبوون).

---

(١) تفسير القرطبي (٦/٢٤٢).

(٢) سورة الأنعام: (١٥).

(٣) سورة الشعراء: (٢١٣).

(٤) سورة الأنفال: (٦٧ -٦٨).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴾[1]، واتە: (ئەگەر محمد ﷺ لە خۆیەوە قسەی بکردایەو بیدابایە پاڵ ئێمە، ئەوا دەمانگرت و نەمان دەهێشت بەردەوام بێت لەسەری، وە ئەو کاتە دەمان مراندو هیچ کەسێکیش نەبوو لە ئێوە کە ڕێگای ئەو کارەمان لێ بگرێت).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴾[2]،
واتە: (ئەی محمد: ئەگەر دامەزراومان نەکردبای لەسەر دینەکەمان، لەوانەیە بۆ ئەوەی هیدایەت وەرگرن کەمێك مەیلت بەلایاندا چوبا، وە ئەگەر ئەو کارەت کردبا ئەوا سزاو عەزابێکی چەند جارەمان توش دەکردی و لە لای ئێمەشەوە هیچ سەرخەرێکت دەست نەدەکەوت).

کەواتە ئەم ئایەتانە گەورەترین بەڵگەن لەسەر نەفی کردنی بانگەشەی ئەو کەسانەی کە زیادەڕەوی دەکەن لە دروست کراوەکانی خوای گەورەدا، ئەگەرچی ئەم دروست کراوانە نزیکیش بن لە خوای گەورەوە، وە لە هەموو بوارەکانی دیندا لە ئەمرو نەهی و شەریعەت داناندا، هیچ کەسێك بەشدارو شەریك نیە لەگەڵ خوای گەورەدا، نە پێغەمبەران و نە هیچ کەسێکی تریش، بەڵکو هەموو پێغەمبەرانیش بەندەی خوای گەورەن و فەرمانیان پێ کراوە بە ڕاگەیاندنی پەیامی خوای گەورە، وە هیچیشیان شەریك و هاوبەشی خوای گەورە نین و هیچ شتێکیشیان لەبەر دەستدا نیە کە تایبەتی خوای گەورە بێت.

---

(١) سورة الحاقة: (٤٤-٤٧).

(٢) سورة الإسراء: (٧٤- ٧٥).

هەروەك لە پێشتر بۆمان ڕوون بۆوە کە ئەم جۆرە کەسانە بە ناوی خۆشویستن و بە گەورە دانانی پێغەمبەر ﷺ چونە ناو خەڵکەوەو شوبهەیان بۆ دروست کردن، وە لەوەشدا زیادەڕەوییەکی زۆریان کرد هەروەك چۆن گاورەکان زیادەڕەویان کرد لە کەسایەتی عیسی سەلامی خوای لێ بێت، وە موشریکەکانیش لەو بت و پەیکەرانەی کە دەیان پەرستن، وە لە هەمان کاتیشدا هەوڵیشیان دەدا بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو شیرك و گومڕایی و بیدعەیەی کە لەسەری بوون، وە بە هۆی ئەم دەربڕینەشیان بۆ بانگەوازی کردنەکەیان خەڵکێکی زۆر باوەڕی پێ کردن و شوێنیان کەوتن، کە هۆکاری سەرەکیشی نەزانین و ناشارەزایی خەڵکەکە خۆیان بوو لە ئایینە پیرۆزەکەیان لە لایەك و زمان لوسی و دەربڕینی ئەوانیش بەناوی خۆشویستنی پێغەمبەرەوە ﷺو چەواشە کردنی خەڵکی بەوەی کە ئەوان لە هەموو کەس زیاتر لە پێغەمبەر ﷺ نزیکن و هاوەڵ و ئەولیای ئەون لە لایەکی ترەوە.

وە چۆن دەبێت ئەوانە خۆشەویست و ئەولیای ئەوبن لە کاتێکدا پێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو دەکەن و دژایەتی سوننەتەکەی دەکەن و ڕەخنە لە حوکم و فەرمانی ئەو دەگرن؟!!

وە چۆن ئەو کەسە دەبێت بە ئەولیای ئەو لە کاتێکدا هەوڵ دەدات و تێ دەکۆشێت بۆ لەناو بردنی شەریعەتەکەی و هەڵوەشاندنەوەی بانگەوازی کردن و بنچینەو بناغەی سەرەکی ئایینەکەی، کە بە تەنها زانین و پەرستنی خوای گەورەو وازهێنانە لە هەموو پەرستراوێکی تر جگە لە پەرستراوی ڕاستەقینەمان؟!!

با بە ووردی و بە جوانی سەیر بکەین و بزانین ئەم پیاوە (دکتۆر محمد العلوي المالكي؟!!) چی دەڵێت:

✓ دەڵێت: دەبێت بوەستی (واتـە: لـە بەرامبـەر قەبرەكـەی) بـە ملكەچـی نوانـدن و ڕێكوپێكـی و خۆشكاندنەوەو زەلیلـی نوانـدن، وە دەسـتی ڕاسـتت بخەیتـە سـەر دەستی چەپت هەروەك چۆن لە كاتی نوێژدا)[1].

✓ وە هەروەها دەڵێت:

نقبل الترب إجلالاً لساكنه      فكل موطئ أقدام مقر فم[2].

واتە: (خۆڵەكەی ماچ دەكەین بۆ بـە گـەورە دانـانی ئـەوەی كـە تیایدایـەتی وە هـەموو شوێن پێیەكی شوێن و بارەگای (دەم)ە بۆ ماچ كردنی).

ئەوەتا خوای گەورەش فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەكات كە بە خەڵكی بڵێت: ﴿قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ﴾[3].

وە هـــەروەها فـــەرمانی پـــێ دەكـــات و دەفـــەرموێت: ﴿قُلۡ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا رَشَدٗا﴾[4].

وە ئەوەش زۆر گەورەیـە لەسـەر ئەوانـەی كـە پێـچەوانەی ئەمـەن و دەڵـێن: (ئـەو (واتـە: پێغەمبـەر ﷺ) سودو زەرەرو خێرو شەڕیشی بە دەستە!) سبحانك هذا بهتان عظيم.

✓ وە هەروەها دەڵێت: (پاشان بزانە كە هەر شتێك بۆ بـە گـەورە دانـانی پێغەمبـەر بێت ﷺ، ئەوا بۆ هیچ كەسێك نیـە كـە لێـی بكۆڵێتـەوەو داوای بەڵگـە بكـات لـە سەری، چـونكە ئـەوە بـێ ئـەدەبی كردنـە بەرامبـەر بـە پێغەمبـەر ﷺ، وە هـەر

---

(١) شفاء الفؤاد (ص١٨٩-١٩٠).

(٢) شفاء الفؤاد (ص١١٤).

(٣) سورة الأعراف: (١٨٨).

(٤) سورة الجن: (٢١).

شتێك کە ئارەزوی دەکەیت لە رووی مەدحەوە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ بیکەو هیچ گرفت و گومانێکی تیادا نیە)[١].

سەیر بکەن و بزانن چ بێ ئەدەبیەك گەورەترە لەوەی کە وترا بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ؟!!

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لا تطروني)، وە هەروەها ئینکاری لە بەرامبەر ئەمانەشدا کرد کە دەیان ووت: (أنت سيدنا، وأفضلنا فضلاً وأعظمنا طولاً)، وە ئەوەش کە وتی: (ماشاءالله وشئت)، وە ئینکاری ئەو کچە بچوکەشی کرد کە وتی: (وفينا نبي يعلم مافي غد).

کەچی ئەم پیاوە رەخنە لە هەموو ئەمانە دەگرێت و بەو پەڕی بێ ئەدەبیەوە دەڵێت: (قل ماشئت في رسول الله ﷺ على سبيل المدح ولا حرج)!!!

وە هەروەها ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی لێکدانەوەیەکی زۆر سەیرو نامۆیان هەیە بۆ فەرمودەی (لا تطروني)، کە ئەوەش لە ڕاستیدا گۆڕینی ماناکەی و لادانیەتی لەو مەبەست و داخوازیەی کە فەرمودەکە هەیەتی، یەکێ لەوانەی کە بەم شێوە نامۆیە فەرمودەکەی لێکداوەتەوە (البوصيري) خاوەنی قەصیدەی (البردة)یە، کە دەڵێت:

(دع ما ادعته النصارى في نبيهم      واحكم بما شئت قولاً فيه واحتكم)

واتە: (واز بهێنەو دوور بکەوە لەوەی کە گاورەکان بانگەشەی بۆ دەکەن دەربارەی پێغەمبەرەکەیان، وە چۆن ئارەزوو دەکەیت حوکم بدە بەسەر ئەو قسانەدا کە دەربارەی پێغەمبەر ﷺ دەکرێن).

پاشان ئەم پیاوە ئەم دێرە شیعرە دەهێنێت و بەم شێوەیە شەرحی دەکات و دەڵێت: (هەر کەسێك مەبەستی مەدح کردنی پێغەمبەرە ﷺ ئەوا ڕێگەی پێدراوە بە هەر شێوەو جۆرێك دەیەوێت مەدحی بکات، تەنها ئەوە نەبێت کە گاورەکان دەربارەی عیسی سەلامی خوایان لێ بێت دەیان وت، کە ئەمەش دروست نیە چونکە سەر دەکێشێت بۆ شیرك! بەڵکو بڵێ: عەبدو نێردراوی خوایە، وە چۆنی ئارەزوو دەکەیت

(١) الذخائر (ص٢٠١).

مەدحی بكە بە سیفاتی كەمال و تەواوو سیفاتی جەلالیەت و ئاكارە جوانەكان، چونكە بە ڕاستی ڕوخسەتت دراوە بۆ ئەمانەو هیچ شتێكت لەسەر نیە.

وە ئەگەر هەموو تواناو دەسەلاتی خۆت بخەیتە كار بۆ ئەوەی وەصفی بكەیت" ئەوا ئەو كاتەش نەت توانیوە تەنها كەمێكیش لە سیفەتە بەرزو جوانەكانی باس بكەیت)[1].

سەیری بێ هۆشی و كەم عەقڵی و ئەو بێ ئەدەبیەیان بكە بەرامبەر خوای باڵا دەست و پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ، فەرمودەی ڕاست و صەحیحی پێغەمبەر ﷺ دەگۆڕن و ماناكەی لادەدەن و بیرو بۆچونی بۆگەنی خۆیان پێش دەخەن و بێ ئەدەبی دەنوێنن لە بەرامبەریداو پاشانیش بانگەشەی خۆشویستن و بە گەورە دانان و شوێن كەوتنیشی دەكەن!!!

ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (لا تطروني)، كەچی شاعیرەكەشیان دەڵێت: (واحكم بما شئت قولاً فيه واحتكم)!!!

وە ئەم پیاوەی لەمەڕ خۆشمان لەشەرحی ئەم شیعرەدا دەڵێت: (واحكم بما شئت مدحاً من صفات الكمال ونعوت الجلال)!!!

بەڕاستی زۆر سەیرە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت زیادەڕەوی مەكەن لە وەصف كردنی مندا، كەچی ئەوان دەڵێن: چۆن دەتەوێت ئاوا وەصفی بكە، تەنها وەك گاورەكان مەڵێن ئیتر قەیناكاو ڕوخسەت دراوە!!!

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەكی تریدا دەفەرموێت: (من محمدی كوڕی عبداللەم، وە من عەبدو نێردراوی خوام، وە حەز ناكەم لەم پلەو پایەیە بەرزم بكەنەوە كە خوای گەورە بۆی داناوم)[2].

---

(١) الذخائر (ص٣٧).

(٢) صحيح: رواه الإمام أحمد في المسند (١٥٣/٣)، والنسائي في عمل اليوم والليلة (ح ٢٤٩،٢٤٨)، وصححه الامام الالباني (رحمه الله) في (السلسلة الصحيحة)(١٠٩٧).

وە هەروەها لە بەرامبەر قسەی جاریەکەدا فەرمووی: (واز لـەوە بهێنـەو ئـەوە بڵـێ کـە پێشتر دەت وت)[١].

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لـێ بێـت لـە شـەرحی ئـەم فەرمودەیـەدا دەڵێـت: (واتـە: واز بهێنە لـەوەی کـە پەیوەنـدی بـە مـەدح کردنـی منـەوە هەیـە، کـە ئـەویش زیـادەڕەوی تێدایەو نەهی لێ کراوە)[٢].

باشە خۆ ئەمانە قسەیەکان نەکردبوو وەك گاورەکان کردیان دەربارەی عیسی سـەلامی خوای لێ بێت، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبـەر ﷺ نـەهی لـێ کـردن لـە مـەدح کردنێك کـە زیادەڕەوی تێدایەو نەهی لێ کراوە، کە ئەمەش بەڵگەیـەکی ڕوون و ئاشـکرایە بـۆ هـەر کەسێك کە چاوو گوێی هەبێت و حەق و ڕاستی پێ ببینێت و ببیستێت.

کەواتە: بترسە ئـەی موسـڵمانی شـوێن کـەوتووی پێغەمبـەر ﷺ لـەوەی بـە شـێوەیەك مـەدحی پێغەمبـەر ﷺ بکـەیت کـە خـوای گـەورە پێـی ڕازی نیـەو لـەو بوارەدایـە کـە زیادەڕەوی کردنەو نەهی لێ کراوە.

بۆیە وریابەو ئاگاداری خۆت بە، نەکەی بکەویتە ناو ئەو زیادەڕەوی کردنەوە کە زۆرێـك لە خەڵکی تێی کەوتوون جا بە بێ ئاگایی بێت یان ئاگادار بن.

خـوای گـەورە هـەموو لایـەکمان بپارێزێـت لـەوەی کـە زیـادەڕەوی بکـەین لـە مـەدحی پێغەمبەردا ﷺو وامان لێ بکات بەم شێوەیە وەصف و مەحی بکەین کە خوای گـەورە ڕێگەی پێداوین و پێغەمبەریش ﷺ پێی ڕازیە.

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٧/٣١٥).

(٢) فتح الباري (٩/٢٠٣).

لە زۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باسـی ڕێـزو گـەورەیی پێغەمبـەر ﷺ كـراوە، كـە هەموو ئەم ئایەتانەش فەزڵ و گەورەیی و ڕێزو پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ دەردەخەن.

بۆ نمونە خوای گەورە لـە قورئـانی پـیرۆزدا دەفـەرموێت: ﴿ أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ ﴾[1]، واتـە: (ئایا سـنگمان فـراوان نـەكردی بۆ وەرگرتنی دینی خوای گەورەو بەدەست هێنانی ڕەوشتە بەرزەكان؟ وە ئایا گونـاهو تاوانەكانمان لەسەر لانەبردیت و لە گوناهی پێشوو دواییت خۆش نەبووین كـە لەسـەرت قورس و گران بوون؟ وە ئایا ناوو ناوبانگی تۆمان بەرز نەكردەوە بەشێوەیەك بووە بـە بەشێك لە كەلیمەی (لا إله إلاّ الله محمد رسول الله)؟).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلضُّحَىٰ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴾[2]، واتە: (سوێند بـە كـاتی چێشتەنگاو كـە كاتی كارو ئیش كردنە، وە سوێند بە شەو كە كاتی ئیسراحەت و حەوانەوەیـە، سـوێند بەوانە خوای گـەورە دەسـتی لـێ هەڵنـەگرتویت و وازی لـێ نـەهێناوی، وە ئـاخیرەت و كۆتایی زۆر خێرترو باشترە بۆ تۆ لە دونیـا، وە پاشـان بەخشـشی خـوای گـەورەت بـۆ دێت و لێت ڕازی دەبێت).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴾[3]، واتـە: (بەڕاسـتی تـۆ لەسـەر بەرزترین خوڕەوشتیت).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَيَهۡدِيَكَ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴾[4]، واتــە: (بەڕاســتی ئێمــە تۆمــان

(١) سورة الشرح: (١-٤).

(٢) سورة الضحى: (١-٥).

(٣) سورة القلم: (٤).

(٤) سورة الفتح: (١-٢).

سەرخست بەسەر کافرو بێ باوەڕو موشریکەکاندا، وە هەروەها لە هەموو گوناهەکانت خۆش بوین ئەوانەی پێشوو و دواتریش، وە نیعمەتی خۆی بە تەواوی بەسەردا ڕشتیت و هیدایەت و ڕێنومایی کردی بۆ ڕێگای ڕاست).

وە هەموو ئەم ئایەتانەش بەڵگەن لەسەر فەزڵ و گەورەیی پێغەمبەر ﷺو لێ خۆش بوونی خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی پێشوو دوایی لەگەڵ ئەوەشدا کە پارێزراو بووە لە گوناهوو تاوان، وە پێغەمبەریش ﷺ زۆر بەمە دڵخۆش بووە، هەروەك لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە فەرموویەتی: (ئایەتێکم بەسەردا دابەزیوە خۆشەویست ترە لەلام لە هەموو دونیا)[1] ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە فەرموویەتی: (بە ڕاستی ئەمشەو سورەتێکم بەسەردا دابەزیوە کە خۆشەویست ترە لە هەموو ئەو شتانەی کە خۆریان بەسەردا هەڵهاتووە، پاشان (إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا)ی خوێندەوە)[2].

وە هەروەها بەڵگەیەکی تر لەسەر گەورەیی و فەزڵی پێغەمبەر ﷺ فەرمودە درێژەکەی شەفاعەتە کە فەزڵی هەموو پێغەمبەرانی تیادا باس دەکرێت، تا دەگاتە سەر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺو پێی دەڵێن: (بەڕاستی خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی پێشوو و دواییت خۆشبووە)[3] ، وە لە ڕیوایەتی (أنس)دا ڕەزای خوای لێ بێت: عیسی سەلامی خوای لێ بێت دەڵێت: بچون بۆ لای محمد ﷺ، چونکە بە ڕاستی خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشوو و دوایی خۆشبووە)[4].

---

(١) صحيح: رواه مسلم (١٧٨٦).

(٢) صحيح: رواه البخاري (٧/٤٥٢).

(٣) صحيح: متفق عليه. اللؤلؤ والمرجان (١/٤٩-٥١).

(٤) صحيح: متفق عليه. اللؤلؤ والمرجان (١/٤٨).

وە هەروەها خوای گەورە فەرمان بە ئیمانداران دەکات کەوا ئەدەب و ڕێزیان هەبێت بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺو بە گەورەو بەڕێزی بزانن، وە ڕێز لەو پلەو پایەیە بگرن کە خوای گەورە بۆی داناوەو کورت ڕەوی و زیادەڕەوی تیادا نەکەن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡ ﴾[١]، واتە: (بەڕاستی ئەی محمد ئێمە تۆمان ناردووە تا ببیت بە شاهید لەسەر ئەوانەی کە ئیمان دەهێنن و موژدەی بەهەشت و ڕەزامەندی خوای گەورەیان پێ بدەیت، وە هەروەها ئینزاری ئەو کەسانەش بکەیت کە بێ باوەڕو کافرن و بیان ترسێنی بەو سزاو عەزابەی کە خوای گەورە بۆی ئامادە کردوون، وە ئیمان بهێنن بە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی، وە خوای گەورە بە تاك و تەنها دابنێن و ڕێز لە پێغەمبەرەکەی بگرن و پشتی بگرن، وە هەروەها تەسبیحاتی خوای گەورە بکەن لە بەیانیان و ئێواراندا، وە بەڕاستی ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ تۆدا بەستووەو بەیعەتیان پێداوی ئەوە بەڕاستی بەیعەتیان بە خوای گەورە داوەو دەستی خوا لە سەرووی دەستی ئەوانەوەیە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴾[٢]، واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە شتێك مەڵێن کە پێچەوانەی قورئان و سوننەت بێت، وە لە خوا بترسن، بەڕاستی خوای گەورە زۆر بیسەرو زاناو بە ئاگایە).

---

(١) سورة الفتح: (٨ – ١٠) .

(٢) سورة الحجرات: (١).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴾[1]، واتە: (ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە دەنگی خۆتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا بەرز مەکەنـەوەو بـەو شـێوەیە قسە لەگـەڵ ئـەودا مەکـەن وەك هەنـدێکتان قـسە لەگـەڵ هەندێکتاندا دەکەن، نەوەکو کردەوەکانتان هەڵبوەشێنەوەو ئێوەش هیچ هەستی پـێ نەکەن).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿ لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾[2]، واتە: (وا مەزانن کە دوعـای پێغەمبـەر ﷺ وەك دوعای خۆتان وایە لەناو یەکتریدا، چونکە دوعای ئەو ڕاستەوخۆ قـەبوڵ دەبێـت و ڕەت ناکرێتـەوە، وە خـوای گـەورە زانـاو ئاگـادارە بەوانـەی کـە خۆیـان لەبـەر چـاوان دەشاردەوەو دوور دەکەوتنەوە، وە با بترسن ئەوانـەی کـە بـێ فـەرمانی فەرمانـەکانی پێغەمبـەر ﷺ دەکـەن بـەوەی کـە توشـی فیتنـەو شـیرك بـن یـان توشـی بـەڵاو سـزاو عەزابێکی توندو بە ئێش ببن لە ڕۆژی دواییدا).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ ﴾[3]، واتـە: (پێغەمبـەر ﷺ لـە پێـشترە بـۆ ئیمانـداران لـە نەفـسی خۆیـشیان، وە خێزانەکانیشی دایکیانن).

(١) سورة الحجرات: (٢).
(٢) سورة النور: (٦٣).
(٣) سورة الأحزاب: (٦).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴾[١]، واتە: (ئەی ئەوانەی کە ئیمانتان هێناوە بۆتان نیە بە هیچ شێوەیەك ئەزیەت و ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدەن، وە بەهیچ شێوەیەکیش بۆتان نیە کە لە دوای مردنی ئەو خێزانەکانی مارە بکەنەوە، چونکە بەڕاستی ئەوە لای خوا زۆر گەورەیە).

وە بەڕاستی هاوەڵە بەڕێزەکان ڕەزای خوایان لێ بێت بە تەواوی مانا ئەدەب و ڕێزیان هەبوو بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ، بەو شێوەیەی کە خوای گەورە پێی ڕازیەو فەرمانی پێ کردووە، وە بە تەواویش گوێڕایەڵیان دەکردو شوێنی دەکەوتن و بە گەورەیان دادەنا، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەو پلەوپایەیەی کە خوای گەورە بۆ پێغەمبەری ﷺ داناوە بەرزتریان نەدەکردەوەو زیادەڕەویان نەدەکرد لە بەرامبەریدا وەك ئەوانەی ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکەن، وە خوای گەورەش لە زۆر شوێنی قورئاندا ئاماژە بەوە دەکات و شاهێدیان بۆ دەدات:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعْدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلْقَرْحُ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾[٢]، واتە: (ئەوانەی کە بە جوانی و چاکی وەڵامی خواو پێغەمبەریان دایەوەو شوێن فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر کەوتن دوای ئەوەی کە توشی ماندوو بوون و ناڕەحەتی بووبوون لە شەڕدا، بەڕاستی ئەوانە لە بەرامبەر ئەو کارە چاکەیانداو ئەو تەقوایەی کە هەیان بوو، ئەجرو پاداشتێکی زۆر گەورەیان هەیە).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِىِّ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِى سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾[٣]، واتە: (بەڕاستی خوای گەورە لە

---

(١) سورة الأحزاب: (٥٣).

(٢) سورة آل عمران: (١٧٢).

(٣) سورة التوبة: (١١٧).

پێغەمبەرو موهاجیرو ئەنصارەكان خۆش بوو، ئەوانەی كە لەگەڵیدا دەرچوون و چـون بۆ جیهاد كـردن لـە غـەزای تەبوكـدا كـە لـە كـاتێكی زۆر گـەرم و ناڕەحەتـدابوو، دوای ئـەوەی كـە هەنـدێكیان خـەریك بـوو دڵـەكانیان توشـی لادان بـێن بـە هـۆی قـسەی مونافیقەكانەوە بەڵام خوای گەورە دامەزراوی كردن و لێیـان خـۆش بـوو، وە بەڕاسـتی خوای گەورە زۆر بە سۆزو بەزەییە).

وە هـــەروەها دەفـــەرموێت: ﴿لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ۞ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ﴾[1]، واتە: (ئەو فەقیرو هەژارانەی كە كۆچیان كـردوو مـاڵ و سـەروەت و سـامانی خۆیـان بـەجێ هێـشت، وە تـەنها مەبەستیـشیان بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە بوو، وە هەوڵیان دەدا لە پێنـاو سەرخـستنی دینـی خـواو پێغەمبەرەكەیـدا، بەڕاسـتی ئەوانـە لەگـەڵ ئـەو بیروبـاوەڕەی كـە هـەڵیانگرتبوو ڕاسـتگۆ بـوون، وە هـەروەها موسـڵمانانی مەدینـەش واتـا ئەنـصارەكان ئەوانەیان خۆش دەویستن كە كۆچیان كردبوو بۆ لای ئەوان واتە موهاجیرەكان).

وە جگـە لـەم ئایەتـە پیرۆزانـەش تەنانـەت دوژمنـانیش شـاهێدی ئـەم ڕێـز گـرتن و ئەدەبەیان بۆ دەدەن لە بەرامبەر پێغەمبەردا ﷺ، ئەوەتا عروەی كـوڕی مەسـعود كـە وەفدی قورەیش بوو لە ڕێككەوتنی حودەیبیە دەڵێت: (ئەی قەوم: سوێند بـە خـوا بـە وەفدو نوێنـەر ڕۆیـشتووم بـۆ لای زۆر لـە پاشـاو فـەرمان ڕەواكـان، ڕۆیـشتووم بـۆ لای قەیصەرو كیسراو نەجاشی، سوێند بـەخوا هـیچ پاشـاو فـەرمان ڕەوایەكم نەبینیوەكـە هاوەڵانی بە گەورەیان زانیبێت هێندەی ئەوەی هـاوەڵانی محمـد ﷺ محمـد بـە گـەورە دەزانن، وە سوێند بە خوا ئەگەر تف و بەڵغەم فڕێ بدات ئەوە لە دەسـتی یـەكێك دایـە لەوان، وە دەیهێنێت بە دەم و چاوو پێستیدا، وە ئەگەر فەرمانێكیان پـێ بكـات پـێش

---

[1] سورة الحشر: (٨– ٩).

بڕكێ دەكەن لە جێ بەجێ كردنی فەرمانەكەی، وە ئەگەر دەست نوێژ دەگرێت نزیكە كوشتار بكەن لەسەر ئاوی دەسـت نوێژەكـەی، وە ئەگـەر قسە دەكـات دەنگیـان نـزم دەكەنەوە لەلای ئەو، وە بەردەوام بە چاوی ڕێـزو گـەورە دانانـەوە تێـی دەڕوانـن)[١] ، لەگەڵ ئەوەشدا زیادەڕەویان نەكرد تیایدا.

وە هـەروەها لـەم نمونانـەی تـر كـە زیـاتر بـە گـەورە دانـان و خۆشویـستنی هـاوەڵان دەردەخات بەرامبەر بە پێغەمبـەر ﷺ و بەڵگەیـە لەسـەر گوێڕایـەڵی و ڕێزگرتنیـان لـە بەرامبەریدا، ئەوەیە كـە ئەنـەس ڕەزای خـوای لـێ بێـت دەڵێـت: (هـیچ كەسـێك نـەبوو خۆشەویـست تـر بێـت لای هـاوەڵان لـە پێغەمبـەر ﷺ، لەگـەڵ ئەوەشـدا كاتێـك كـە دەیانبینی لەبەری هەڵنەدەستان، چونكە دەیانزانی كە ئەمەی پێ ناخۆش بوو)[٢] .

بەڕاستی ئەمەیە بەگەورە دانـان و خۆشەویـستی حـەق، نـەك ئـەوەی كـە ئـەم پیـاوەو هاوشێوەكانی بانگەشەی بۆ دەكەن، كە هەواو ئارەزوەكانی خۆیان پێش فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ دەخەن و لە سوننەتی ڕاستەقینەی ئەو لادەدەن.

وە بانگەوازی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوە بوو كە هەرچی شـیرك و زیـادەڕەوی هەیـە لە ڕەگەوە هەڵی بكێشێت و بـە تـەنها خـوا پەرسـتی جێگـای ئـەو شـیرك و گـومڕایی و زیادەڕەویە بگرێتـەوە، كەچـی ئـەم جـۆرە كەسـانە خـودی پێغەمبـەر ﷺ دەكـەن بـە شەریك و هاوەڵی خوای گەورەو دەیپەرستن و قەبرەكـەی لـە مەككـەو عەرشـی خـوای گەورە بە چاكترو گەورەتر دەزانن.

بۆ نمونە ئەم پیاوە (محمد العلوي المالكي) لە وەصفی قەبری پێغەمبـەردا ﷺ دەڵێت: (والبقعة التي دفن فيها أفضل من الكعبة ومن العرش)[٣] ، واتە: (ئەو پارچە زەویـەی كـە لێی نێژراوە چاكترو باشترە لە كەعبەو لە عەرش).

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٥/٣٣٠).

(٢) صحيح: صححه امامنا الالباني(رحمه الله) في (مشكاة المصابيح)(٤٦٩٨).

(٣) الذخائر (ص٢٠٦).

وە هەروەها دەڵێت:

وأفضل من سموات وأرض      وأملاك بأفلاك تجول

ومن عرش ومن جنات عدن      وفردوس بها خير جزيل[١]

وە هەروەها دەڵێت: (وە سەیر کردنی حوجرەی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ عیبادەتە بە قیاس کردنی لەسەر کەعبە)[٢].

ئایا پێغەمبەر ﷺ تورە نابێت لەو زیادەڕەویەو ڕازی دەبێت لە یەکێك کە قەبرو ماڵەکەی بکات بە کەعبەو قیبلەو یان بیکات بە بتێك و بپەرسترێت؟!!

وە ئایا پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە نێردراوە کە بە خەڵکی بڵێت واز لە پەرستنی ئەم بت و پەیکەرانە بهێنن و من و قەبرەکەم لە جیاتی ئەمانە بپەرستن؟!!

وە ئایا بۆ ئەوە هاتووە کە نەهی لە خەڵکی بکات لە زیادەڕەوی لە دروست کراوەکانی خوای گەورەداو فەرمانیان پێ بکات بە زیادەڕەوی کردن لە خۆشویستن و بە گەورە دانانی ئەودا؟!!

وە ئایا بۆ ئەوە هاتووە کە نەهی لە گاورەکان بکات و بڵێت: واز لە زیادەڕەوی بهێنن لە دینەکەتاندا، چونکە ئەوە سودتان پێ ناگەیەنێت، بەڵکو زیادەڕەوی لە مندا بکەن بەو شێوەیەی کە دەتانەوێت؟!!

هەموو ئەمانە دوورن لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە ﷺ، بەڵکو فەرمانی کردووە بە عیبادەت کردن بە تەنها بۆ خوای گەورە، وە نەهی کردووە لەوەی کە زیادەڕەوی تیادا بکرێت و قەبرەکەشی بکرێت بە مزگەوت، چ جای ئەوەی کە جگە لە خوای گەورە بپەرسترێت.

---

(١) الذخائر (ص٤٤).

(٢) شفاء الفؤاد (ص١٩٤).

وە هەروەها نەهی كردووە لە هاوەڵەكانی كە هەستن لە پشتی ئەوەوە نوێژ بكەن لە كاتێكدا كە ئەو دانیشتووە، لەگەڵ ئەوەشدا كە هەستان بۆ نوێژ عیبادەت و بە گەورە دانانی خوای گەورەیە.

وە نەهی لێ دەكردن كە فەزڵی ئەو بدەن بەسەر پێغەمبەرانی تردا سەلامی خوایان لێ بێت، بۆ نمونە كاتێك كە پێیان وت: (یـا خـیر البریة)، فەرمووی: (ئەوە ئیبراهیمی خۆشەویستی خوایە)[1] ، وە كاتێك پرسیاریان لێ كرد: (كێ چاكترینی خەڵكە؟) فەرموی: (یوسفی پێغەمبەری خوا)[2].

وە ڕۆژێك لە ڕۆژان بە هاوەڵانی نەفەرموو: مەدحم بكەن، چ جای ئەوەی كە فەرمانیان پێ بكات بە زیادەڕەوی، بەڵكو فەرمانی پێ دەكردن بە مەدح كردنی خوای گەورەو پێی دەفەرموون: (هیچ یەكێك نیە كە مەدح كردنی بە لاوە خۆشەویستتر بێت لە خوای گەورە، لەبەر ئەمەشە خوای گەورە مەدحی خۆی كردووە)[3].

وە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژەكانی كۆتایی ژیانیداو لە كاتێكدا كە لەسەرە مەرگ دابوو، نەهی لێ دەكردن و وریای دەكردنەوە كە قەبرەكەی نەكەن بە مزگەوت، هەروەك دایكە عائیشە ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەكاتی تووش بوونی بەو نەخۆشیەی كە لێی هەڵنەستایەوە فەرمووی: (خوای گەورە لەعنەتی كردووە لە جولەكەو گاورەكان، گۆڕی پێغەمبەرانیان دەكرد بە مزگەوت)[4].

---

(١) صحيح: رواه مسلم (٢٣٦٩).

(٢) صحيح: متفق عليه. اللؤلؤ والمرجان (١١٩/٣).

(٣) صحيح: متفق عليه. جامع الأصول (٤٣١/٨).

(٤) سبق تخريجه.

هیچ گومانی تیادا نیە کە خوای گەورەو بـاڵا دەسـت بـۆ هـەموو شـتێك ئەنـدازەی داناوەو بەندەکانی خۆی وریا کردۆتەوە لەوەی کە ئەم ئەندازەیـە نەشـکێنن و بـە هـیچ شێوەیەك زیادو کەمی تیادا نەکەن.

وە ئەو شتەی کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە قسەی لەسەر بکەین بریتیـە لـە زیـادەڕەوی کردن لە خۆشویستن و بە گەورە دانانی پێغەمبەر ﷺ، وە خوای گـەورە سنورێکیـشی بۆ ئەو خۆشویستن و بە گەورە دانانە داناوەو دروست نیە هیچی لێ زیادو کـەم بکرێـت و دروست نیە زیادەڕەوی لێ بکرێت، چونکە ئەگەر لێی زیاد کراو زیادەڕەوی تیادا کـرا ئەوا گومانی تیادا نیە کە سەر دەکێشێت بۆ شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَندَادًا وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[1]، واتـە: (هاوبەش و هاوەڵ بۆ خوای گەورە دامەنێنن، وە ئێوە دەزانـن کـە خـوای گـەورە هـیچ شەریك و هاوەڵێکی نیە).

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾[2]، واتـە: (لـەناو خەڵکیـدا کەسـانێك هـەن هاوبـەش و هاوەڵ بۆ خوای گەورە دەدەنێن و خۆشیان دەوێن وەك چۆن خـوای گـەورەیان خـۆش دەوێت، وە ئەوانەش کـە ئیمانیـان هێنـاوە زۆرتـرین خۆشەویستیان بـۆ خـوای گـەورە هەیە).

وە هەروەها خوای گەورە پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە کە هیچ پەرستراوێکی بـە حـەق نیـە جگـە لـە خـوای گـەورە، وە دڵـەکان خـاڵی بکـەن لـە خۆشەویستی بۆ هەر شتێك جگە لە خوای گەورە، واتە خۆشەویستی تەواویان تەنها بۆ خوای گەورەو باڵا دەست بێت.

(١) سورة البقرة: (٢٢).

(٢) سورة البقرة: (١٦٥).

بەڵام موشریکەکان —ئەوانەی هاوبەشیان بۆ خوا دادەنا— بتیان لەگەڵ خوای گەورە دەپەرست و خۆشیان دەویستن هەروەك چۆن خوای گەورەیان خۆش دەویست و دەیان کردن بە شەفاعەتکار لای خوای گەورە.

بەڵام ئیمانداران زۆرترین و تەواوترین خۆشەویستیان هەیە بۆ خوای گەورەو هەر ئەویش بە تەنها دەپەرستن، وە هیچ شتێکی تریشیان وەك خوای گەورە خۆش ناوێت" نە پێغەمبەران و نە پیاوچاکان و نە هیچ کەسێکی تر، پاشان لە دوای ئەم خۆشەویستیەیان بۆ خوای گەورە پێغەمبەریان ﷺ لە هەموو کەسێك زیاتر خۆش دەوێت، وە دەشزانن کە ئەو عەبدو بەندەی خوایەو دینی خوای گەورە ڕادەگەیەنێت، وە گوێڕایەڵیشی دەکەن لە هەر شتێك کە فەرمانی پێ کردبێت، وە هەواڵیشی بە هەر شتێك دابێت ئەوا بەڕاستی دەزانن، وە هیچ ئومێدێکیشیان نیە تەنها بە خوای گەورە نەبێت، وە جگە لە خوای گەورەش لە هیچ شتێکی تر ناترسن و داوای کۆمەك و یارمەتیش لە هیچ کەسێك ناکەن جگە لە الله[1].

وە هەروەها قورئانی پیرۆز جیاوازی بۆ کردووین لە نێوان خۆشەویستی و بە گەورە دانانمان بۆ خوای گەورەو خۆشەویستی و بە گەورە دانانمان بۆ دروست کراوەکانی خوای گەورە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا۟ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَقَالُوا۟ حَسْبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴾[2]، واتە: (ئەگەر ئەوان ڕازی بن بەوەی کە خواو پێغەمبەر پێی بەخشیون، وە بڵێن: تەنها خوای گەورەمان بەسەو لە داهاتوشدا خوای گەورە لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەشمان دەدات و پێمان دەبەخشێت، وە هەروەها پێغەمبەریش ﷺ لەوەی کە دەستی دەکەوێت هەر پێمان دەبەخشێت، وە ئێمە ئومێدمان بە خوای گەورە هەیەو پشتمان هەر بەو دەبەستین).

---

(١) بڕوانە (مجموع الفتاوى) (١١/٥٢٣-٥٣٠).

(٢) سورة التوبة: (٥٩).

لێرەدا ئەوە باسی ئەوە کراوە کە ڕازی بن بەوەی کە خوای گەورەو پێغەمبەر ﷺ پێی بەخشیون، چونکە پێغەمبەر ﷺ هۆکارێکە لە نێوان ئێمەو خوای گەورەدا لە گەیاندنی ئەمرو نەهیەکانی خوای گەورەو ڕوون کردنەوەی ئەو شتانەی کە حەڵاڵ و حەرامن.

پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ ﴾، لێرەدا خوای گەورە ناوی پێغەمبەر ﷺ ناهێنێت، چونکە پشت و پەنای بەندە ئیماندارەکان تەنها خوای گەورەو باڵا دەستە.

پاشان دەفەرموێت: ﴿ سَيُؤْتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَرَسُولُهُۥٓ ﴾، وە لێرەشدا باس لە بەخشین دەکات بە تەنها بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ، بەڵام ووشەی (فضل) دەخاتە نێوانیانەوە، چونکە فەزڵ و بەخشین تەنها هی خوای باڵا دەستە.

پاشان لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێت: ﴿ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴾، ئینجا ڕوو کردن و پشت بەستن تەنها بۆ خوای گەورە دادەنێت، بەبێ پێغەمبەر ﷺو جگە لەویش لە دروست کراوەکانی تر[1].

وە هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾[2]، واتە: (ئەوانەی کە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر دەکەن و لە خوای گەورەش دەترسن و تەقوای ئەو دەکەن، ئەوا بەڕاستی ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن).

وە ئەم ئایەتە پیرۆزەش باسی ئەوە دەکات کەپێویستە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر ﷺ بین، بەڵام ملکەچی و ترسان و تەقوامان تەنها دەبێت بۆ خوای گەورە بێت و بەس، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت:

---

(١) بڕوانە (مجموع الفتاوى) (١/٢٩٢_٢٩٣).

(٢) سورة النور: (٥٢).

﴿ وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴾[1]، واتە: (بە تەنها تەقوای من بكەن و لە من بترسن)، وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ ﴾[2]، واتـە: (لـە خـەڵكی مەترسـن، بەڵكو لە من بترسن)[3].

وە هەروەها بە هەمان شێوە پـشت پـێ بەسـتن و داوای یارمـەتی كـردن و گەڕانـەوەو داوای لێ خۆش بوون كردن، هەموویان بە تەنها حەق و مـافی خـوای پـەروەردگارن، وە هیچ كەسێك لەگەڵیدا هاوبەش و شەریك نیە، نە فریشتەكان و نە پێغەمبەران و نە پیاو چاكان و نەهیچ یەكێك لە دروست كراوەكـانی تـر، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾[4]، واتە: (پشت هەر بە خوای گەورە دەبەستم و گەڕانەوەشم هـەر بـۆ لای ئـەوە)، وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾[5]، واتە: (خوایـە گیـان تـەنها تـۆ دەپـەرستین و داوای كۆمـەكی و یارمـەتیش هـەر لـە تـۆ دەكـەین)، وە هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿ وَأَنِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ ﴾[6]، واتــە: (داوای لێ خۆش بوون لە خوای گەورە بكەن و پاشانیش تەوبە بكەن و بگەڕێنـەوە لای خوای گەورە).

كەچـی بەڕاسـتی ئەوانـەی پێـچەوانەی حـەق و ڕاسـتین بـە وێنـەی محمـد المـالكی و هاوشـێوەكانی، حـەق و مافـەكان تێكـەڵاو دەكـەن لـە نێـوان خـوای گـەورەو دروسـت كراوەكانیـدا، وە بەسـەر هـەر تاوانێكـدا تـاوانێكی گـەورەتر دەهێـنن، وە لـە هـەمان كاتیشدا بێ ڕێزی و بێ ئەدەبی دەنوێنن بەرامبەر ئەوانەی كە خـوای گـەورە هیدایـەتی

---

(١) البقرة: (٤١).

(٢) سورة المائدة: (٤٤).

(٣) بروانە (مجموع الفتاوی) (١/٦٨).

(٤) سورة هود: (٨٨).

(٥) سورة الفاتحة: (٥).

(٦) سورة هود: (٣).

داون بۆ حەق و بە تەنها پەرستنی خوای گەورەو بە نەزان و نەفامیان لە قەڵەم دەدەن.

لەمەوە بۆمان دەرکەوت کە خوای گەورە بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی تەواوی داناوە، بەڵام ئەمان گوێ نادەن بەم ئەندازەیەی خوای گەورەو زیادەڕەوی دەکەن لە دروست کراوەکانیدا، بە شێوەیەك کە هیچ شتێکیان نەهێشتۆتەوە بۆ خوای پەروەردگار لە سیفەت و ناوو کردارە جوانەکانیدا، وە بە هەموو شێوەیەکیش ڕووی خۆیان لە دروست کراوەکانی خوای گەورە دەکەن و هەموو جۆرە دوعاو پاڕانەوەیەکیان لێ دەکەن و ئومێدێکی زۆریشیان پێ هەن، وە ئەمەش بە شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان نازانن، لە کاتێکدا شیرك و هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە بریتیە لە: هاوبەش کردنی دروست کراوەکانی خوای گەورە لەگەڵ خوای گەورەو باڵا دەستدا لە بە گەورە دانان و خۆشویستن و عیبادەت بۆ کردندا.

خوای گەورە هەموو لایەکمان بپارێزێت بەوەی کە ئەم ئەندازەو سنورانە نەبەزێنین کە خوای گەورە بۆ دروست کراوەکانی خۆی دایناون.

لێرەدا پرسیارێکی زۆر گرنگ دێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە: مەبەستی ئەم جۆرە کەسانە چیە کەوا زیادەڕەوی دەکەن لە وەصف کردنی کەسایەتی پێغەمبەردا ﷺ و زۆر پێداگری دەکەن و سورن لەسەری؟

وەڵامی مەبەستەکەی ئەوان ڕوون و ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە کە لە پشت ئەم زیادەڕەوییەوە دەیانەوێت داوای بەرپرسیارێتی و گەورایەتی و پێشەوایەتی بکەن بەسەر خەڵکیدا، وە هەروەها گەیشتن بە پلەی بەرزو دەست خستنی سودو قازانجە دونیاییەکان، وە لە هەمان کاتیشدا دەیانەوێت بگەن بەوەی کەوا خەڵکی بە گەورەیان بزانن و بە پیرۆزو چاکیان دابنێن و زیادەڕەوی بکەن تیایاندا.

وە هیچ گومانیشی تیادا نیە کە ئەم ڕاستیە پێویستی بە بەڵگە نیەو هەروەك مانگی چواردە وایەو پێویست بە پەنجە بۆ ڕاکێشان ناکات، وە حاڵی بەشێکی زۆر لە خەڵکی باشترین و گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەم باسە، کە ڕۆژانە دەبینین چەندەها زیادەڕەوی لەم بەناو پێشەوایانەدا دەکرێت، هەر لە ناو نانیان بە چەند ناوێك کە بە هیچ شێوەیەك ئەم ناوانە دروست نین بەکار بهێنرێن تا دەگاتە دەست و قاچ و پێڵاو ماچ کردن کە لەلایەن خەڵکی نەزان و نەفامەوە ئەنجام دەدرێت، بگرە گەیشتۆتە ئاستێك کە چەندەها جار بیستراوەو بینراوە لە کۆڕەکانیاندا کە بە وێنەو سیدی و کاسێتی ڤیدیۆیی بڵاو کراوەتەوە کە خەڵکانێکی زۆر کڕنۆش و سوجدە بۆ بەناو پێشەواو شێخەکانیان دەبەن، سوجدەیەك کە بە هیچ شێوەیەك دروست نیە بۆ غەیری خوای پەروەردگار ببرێت و ئەنجام بدرێت، وە هەر کەسێك ئەمە بکات ئەوا بە بێ هیچ گومان و دوو دڵیەك ئەو کەسە دروست کراوێکی خوای گەورەی کردووە بە هاوبەش بۆ خواو پەنا بە خوا ئەو کەسە لە دینی ئیسلام دەرچووە.

وە هەروەك پێشتر ئاماژەمان پێدا یەکێك لەم جۆرە زیادەڕەویانە بریتیە لە بەکارهێنانی چەند ناوێك بۆ پێشەواکانیان کە دروست نین، وەك:

✓ یەکێك لەو ناوانە (العارف)ە، کە بڵاوترین و بەناو بانگترینیانە، وە ئەوەش لای ئەوان مانایەکی تری هەیە جیا لەوەی کە خەڵی لێی تێدەگات، ئەویش لای ئەوان

ئەو کەسەیە کە دەزانێت خوای گەورە بریتیە لەو کەون و گەردوونە، وە هەر شتێك کە ئەو دەیبینێت یان دەیبیستێت لە هەر شوێنێك ئەوە خوایە، پاکو بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار لەوەی کە ئەوان دەیلێن.

ئەی با بزانین سیفەتەکانی (عارف) لای ئەوان چین؟

هەندێکیان دەڵێن: (عارف) ئەو کەسەیە کە خوای گەورە شاهێدی بۆ زات و سیفات و کردارەکانی داوە)[1].

وە هەندێکی تریان دەڵێن: (هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کەسێك کە گەیشتۆتە پلەی (عارف)، ئەوە وەك هەڵسوکەوت کردن وایە لەگەڵ خوای گەورەدا ........ وە هەروەها خوڕەوشتی خۆی ڕازاندۆتەوە بە خوڕەوشتی خوای گەورە)[2].

وە یەکێکی تر دەڵێت: (ئەگەر بەندەیەك گەیشتە ئاستی (عارف) ئەوا خوای گەورە ئامۆژگاری دەکات و ئەوەی مەبەستی بێت دەیخاتە دڵیەوە)[3].

✓ وە هەروەها یەکێکی تر لەو ناوانەی کە بۆیان بەکار دەهێنرێت بریتیە لە ناوی (الولي)، کە ئەمەش لە ناوە تایبەتیەکانیانە، وە دیارە مەبەستیشیان ئەو ناوە گشتیە نیە کە خەڵکی ئاسایی تێی گەیشتوون، وە ئەو پلەیەش لای ئەوان زۆر گەورەترە لە پلەی پێغەمبەرایەتی و پەیامی خوای پەروەردگار، بۆ نمونە دەڵێن:

مقام النبوة في برزخ　　فوق الرسول ودون الولي

✓ وە لەو ناوانەی تریش کە بۆیان بەکار دەهێنن (القطب) و (الغوث) و (الوتد) و (البدل)و زۆر ناوی تریش کە خوای پەروەردگار هیچ بەڵگەیەکی لەسەر دانەبەزاندوون، وە واش گومان دەبەن کە خاوەنی ئەم ناوانە بە فریای خەڵك

(١) حاشية العروسي (١/٨).

(٢) الرسالة القشيرية (ص١٤٢).

(٣) الرسالة القشيرية (ص١٤٢).

دەکەون و پارمەتیان دەدەن جگە لە خوای گەورە، وە هەروەها دەتوانن کاریگەریان لەسەر گەردوون هەبێت بەهەر شێوەیەك کە مەبەستیان بێت و ئارەزوو بکەن!!! پەنا بە خوای گەورە لە گومڕایی.

وە بۆ سەلماندنی ئەم قسانەی سەروەش بە پێویستی دەزانین کە چەند نمونەیەك لە قسەی پێشەواکانیان بهێنینەوە بۆ ئەوەی کەس وا گومان نەبات کە ئەمە بوهتانە بۆیان دەکرێت و دەدرێتە پاڵیان:

١. یەکێك لە پێشەوا گەورەکانیان دەڵێت: (هەندێ لە وەلیەکان هەن کە فریشتەکان سوجدەی بۆ دەبەن)[1].

٢. وە (الشعراني) باس لە کەراماتی (الشويمي) دەکات و دەڵێت: (پیاوێك دەساڵ لە تەمەنی خۆی بەخشی بە (الشويمي)، پاشان ئەم پیاوە مردو (الشويمي) لەو کاتەدا ئامادە نەبوو، دواتر کاتێك هاتەوە ئەم پیاوە دەشۆرا، ئنجا ووتی: چۆن مرد؟ سوێند بە عیززەتی پەروەردگار کە من ئامادە بومایە نەم دەهێشت بمرێت)[2].

٣. وە هەروەها (النبهاني) لە شێخ جاکیری کوردیەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (بە هیچ شێوەیەك پەیمانم لە هیچ موریدێك وەرنەگرتووە تا ئەو کاتەی کە ناوەکەیم بینیوە لە (لوح المحفوظ)دا نوسراوە)[3].

٤. وە هەر (النبهاني) باس لە کەراماتی (عبدالرحمن الجامي) دەکات و دەڵێت: (جارێکیان لە بەهاردا لە قەراغی ڕووبارێك دانیشتبوو کە پڕ بووبوو، لەو کاتەدا لاشەی ژوشکێکی مردوو لەسەر ڕووی ئاوەکە دەرکەوت، پاشان شێخ جامی گرتی و دەستی بە پشتیدا هێنا، یەکسەر شوێنەواری ژیان تیایدا دەرکەوتەوە)[4].

---

(١) الفتح الرباني (ص٣٧٠).

(٢) الطبقات الكبرى (٢/١٠٣).

(٣) جامع الكرامات (٢/٤).

(٤) جامع الكرامات (٢/٥٤).

٥. هەر (النبهاني) دەربارەی كەراماتی یـەكێك لـە هـاوەڵانی شـێخ حسین دەڵێت: (ئەم پیاوە فـەرمانی بـە هـەور كـرد كـە بـاران ببارێنێـت، یەكسـەر لـەو كاتـەدا بـارانی بارانـد)، وە هـەروەها دەڵێت: (جارێكیـان هاتـە (الجعفریـة) وە نزیكـەی پـەنجا منـداڵ شـوێنی كـەوتبون و پێـی پێدەكـەنین، ئـەویش وتـی: ئـەی عزرائیـل ئەگـەر ڕۆحیـان نەكێشیت ئەوا لـە دیـوانی فریـشتەكان دوورت دەخەمـەوە، یەكسـەر ئـەویش هـەمووی مراندن)، وە هەروەها دەڵێت: (قازیەك پێی وت: بێ دەنگ بە، ئەویش پێی وت: تۆ بـێ دەنگ بە، یەكسەر قازیەكە كەڕو كوێرو لاڵ بوو)[1].

وە زۆر شتی زیاترو زۆرتر لەم گومڕایی و درۆو دەلەسانەی كە ئەوان باسی دەكـەن هەیە، كە پڕن لە شتی ناڕاست و بێ مانا كـە هـەموو ئیمانـدارێكی ڕاسـتەقینەو خـاوەن عەقڵێكی ساغ بە درۆی دەزانێت و بڕوا بە خورافەو قسە پڕو پوچەكانیان ناكات.

(وە زیادەڕەوی كردنیشیان لە بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ هۆكارێكە بۆ زیـادەڕەوی كـردن لە شەخسی خۆیانداو دەیانەوێت بە گەورە بزانرێن، وە سیفەتی وایان دەدرێتە پاڵ كـە لە سیفەتی پەروەردگارێتی و پەرستراوێتی خوای گەورەن، وە بە وێنـەی ئـەوەو بگـرە بە وێنەی نیوەی ئەوەش بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ نەوتراوە!!!

وە ئەمەش كە پشتگیری ئەم قسانە دەكات، قـسەكانی خۆیـانن كـە بـۆ نمونـە دەڵـێن: وەلـی زۆر لـە پێغەمبــەرو نێردراوەكـان بـەڕێزترن هـەروەك پێـشتر باسمـان كـرد، وە هەروەها پێیان دەڵـێن: (خاتم الأولیاء) وە واش گومـان دەبـەن كـە ئەمـە زۆر بـەڕێزترو چاكترە لە كۆتایی پێغەمبەران ﷺ)[2].

وە هەروەها ئەم (محمد العلوي)یەی لەمەڕ خۆشمان دەربارەی تایبەت مەندیەكانی ئـەم ئوممەتـە دەڵێـت: (لـەم ئوممەتـەدا خـەڵكانێك هـەن كـە دەگەنـە ئاسـتی فریـشتەكان، لەوەی كە بێ پێویست دەبن لە خواردن و خواردنەوە بە هۆی تەسبیحات كردنەوە)[3].

---

(١) جامع الكرامات (٢/٢٨٦).

(٢) بڕوانە: مجموع الفتاوى (١١/٤٤٤).

(٣) الذخائر (ص٢١٣).

وە هـەروەها خـاڵێكی تـریش كـە پـشتگیری ئـەوە دەكـات كـە ئەمانـە مەبەسـتیان زیادەڕەوی كردنە لە خودی ئەوانـدا، ئـەم جـۆرە دوعـا كـردن و پاڕانەوەیەیـە كـە ئـەم (محمد العلوي)یە لە كتێبی (شفاء الفـؤاد)داو لـە كـاتی زیـارەتی قـەبری پێغەمبـەر ﷺ دەڵێت: (خوایـە گیـان ڕۆحـی مـن تـەواو بكـەو بەسـەریدا بڕێـژە هـەروەك چـۆن ڕۆحـی تەواوترین كەسی ئەم ئوممەتەت تەواو كرد)، تـا دەڵێـت: (زوهـدێكم پـێ ببەخـشە وەك زوهدی تەواوترینی ئـەم ئوممەتـە، وە هـەروەها وەرع و زانـستێك وەك وەرع و زانـستی ئەو، وە نورێك وەك نوری ئەو، وە تێگەیـشتنێك وەك تێگەیـشتنی ئـەو، وە لـێ قـەبوڵ كردنێك وەك لێ قەبوڵ كردنی ئەو)[1].

وە گومانی تیادا نیە كە ئەمەش زیادەڕەوی كردنـە لـە دوعـا كردنـدا، وە هـەروەها بـێ ئەدەبی كردنە لە بەرامبەر خوای گەورەو پێغەمبـەر ﷺ، كـە داوای شـتێك دەكـات كـە دروست نیەو دەستی ناكەوێت، كـە ئـەویش داواكردنـی پلـەی پێغەمبەرایەتیـە پـەنا بـە خوای پەروەردگار، كە بریتیە لە داوا كردنی عیلم و نورێك كە خوای گەورە داویەتی بـە پێغەمبەر ﷺ، وە پێی وایە كە دوعا كردن لای قـەبر وەڵام دەدرێتـەوە، وە پێـی وایـە كە هەر كەسێك ئاوا بكات ئـەوا وەڵام دەدرێتـەوەو نـورو عـیلم و زانـست و تێگەیـشتنی وەك پێغەمبەری ﷺ دەست دەكەوێت و دەگاتە ئەو ئاستەی كە ئەو پێی گەیشتووە.

كەواتـە ئەگـەر ئـەم قـسەیە وابێـت ئـەی باشـە چ تایبـەت مەندیـەك بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەمێنێتەوە تا لە هەموو مرۆڤەكانی تر جیا بكرێتەوە؟!!

---

(١) شفاء الفؤاد (ص١١٨-١١٩).

# بەندی پێنجەم:

## بەشی یەکەم

## ژیانی پێغەمبەران سەلامی خوایان لیّ بێت لە ناو گۆڕدا

## بەشی دووەم

## شەرح و تەخریج کردنی ئەم فەرمودانەی کە باسیان کردن

## بەشی سێیەم

## ڕوون کردنەوەی ئەم فەرمودانەی پێشوو لە ژێر ڕۆشنایی بەڵگە شەرعیەکاندا

گەورەترین شوبهەو گومانی ئەم جۆرە کەسانە لە بەرامبەر خەڵکیدا بریتیە لەوەی کە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لەناو گۆڕەکانیاندا زیندوون، بەشێوەیەك کە گومانیان وایە ئەم ژیانەی ئەوان لەناو گۆڕەکانیان ژیانێکی ئاسایی و تەواوەو تەنها بە مردنێکی کاتی مردوون و پاشان ڕۆحیان بە بەردا کراوەتەوە هەروەکو جاران، لەسەر ئەم بنەمایەش کە ئەوان پێیان وایە زیندوون و نەمردوون کۆمەڵێك حوکمی بێ بنچینەو بنەما دەدەن، لەوانەش:

❁زیارەت کردنی گۆڕەکانیان وەك زیارەت کردنیان وایە لە ژیانی حەقیقی و ئاساییدا.

❁وە هەروەها گومانیان وایە کە سوننەتە، بەڵکو واجبیشە! سەفەر کردن و هەوڵ دانێکی زۆریش لەو پێناوەدا بە مەبەستی زیارەت کردنیان و بگرە بە گەورەترین عیبادەتیشی دەزانن.

❁وە سەلام کردن لێیان بە دەنگ، چونکە پێیان وایە کە ئەوان دەبیستن و دەزانن و ئاگادارن بەوانەی کە سەردانیان دەکەن، وە بگرە زۆر لەو کاتە زیاتر بە ئاگان کە زیندوو بوون، بە تایبەتی پێغەمبەر ﷺ کە ئاگای لە نیەت و هەموو ئەو شتانە هەیە کە بە دڵی خەڵکیدا دێت!!!

❁وە هەروەها یەکێکی تر لەو حوکمانەی کە دایان ناوەو مەبەستی سەرەکیشیانە، بریتیە لەوەی کە دەڵێن: شەرعی و دروستە کە داوای شەفاعەت لە پێغەمبەران بکەیت و دروستە تەوەسولیان پێ بکەیت و لێیان بپاڕێیتەوەو داوای بە فریا کەوتن و یارمەتیان لێ بکەیت، وە بەڵکو داوای هەر شتێك بکەیت کە خۆت مەبەستتە، تەنانەت داوای لێ خۆش بوون لە گوناهو داپۆشین و لابردنی عەیبەکان و ڕزگار بوون لە ئاگرو خستنە ناو بەهەشتەوە.

❁وه ئەوەتا ئەم پیاوه (محمد العلوي) دەڵێت: (بەڕاستی ڕۆحی پێغەمبەران لە دوای مردنیان لێیان جیا نابێتەوه بەڵکو بۆیان دەگێڕدرێتەوه، وه دەرناچێت لەو لاشەیەیان کە نارزێت)[١].

❁وه هەروەها دەڵێت: (رد الله عليَّ روحي) بە واتای: (قسە کردنم بۆ دەگێڕێتەوه)، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە بەردەوامی زیندووەو بە هیچ شێوەیەك ڕۆحەکەی لێی جیا نابێتەوه، چونکە گومانی تیادا نیە کە پێغەمبەران زیندوون لەناو گۆڕەکانیاندا)[٢].

❁وه هەروەها دەڵێت: (وه لە فەرمودانەشەوه ئەوه دەردەکەوێت و دەزانرێت کە پێغەمبەر ﷺ بە بەردەوامی زیندووه)[٣].

❁وه هەروەها دەڵێت: (مردنی ڕاستەقینە بەردەوام نیە لەسەر ئەو، بە هۆی گەڕانەوەی ژیانی تەواوەتی بۆی بە بەردەوامی)[٤].

❁وه هەروەها دەڵێت: (قسە کردن لەسەر ئەم بابەتە زۆر درێژ بۆوه، چونکە ئەو کەسەی کە سەردانی پێغەمبەر ﷺ دەکات و لەبەر دەستیدا دەوەستێت، دەزانێت کە پێغەمبەر ﷺ زیندووەو دەنگی دەبیستێت و ئاگای لێیەتی و دەزانێت کە ئەو کەسە تەوەسولی پێ دەکات و داوای شەفاعەتی لێ دەکات، وه داوای ئەوەی لێ دەکات کە شەفاعەتی بۆ بکات لای پەروەردگار تا لێی ڕازی بێت و خێری دونیاو دوا ڕۆژی پێ ببەخشێت)[٥].

---

(١) شفاء الفؤاد (ص٢٨).

(٢) الذخائر (ص١٣٤).

(٣) شفاء الفؤاد (ص١٢٩).

(٤) شفاء الفؤاد (ص١٤٠).

(٥) شفاء الفؤاد (ص١٤٤).

✿وە هەروەها دەڵێت: (جیاوازی نیە لە نێوان ژیان و مردنـی پێغەمبـەردا ﷺ لـە بینین و بە ئاگا بـوون لـە ئوممەتەکـەی، وە ئاگـای لـە نیـەت و مەبەسـتیان هەیـە، وە ئەمەش لای من ڕوون و ئاشکرایەو شاراوە نیە)[1].

✿وە هەروەها دەربارەی سەردانی گـۆڕی پێغەمبـەران سـەلامی خوایـان لـێ بێـت دەڵێت: (ئەگەر هاتی بۆلایان ئەوا بە زەلیلی و هەژاری بچۆو خـۆت بشکێنەوە، پاشـان بیان کە بە وەسیلە[2] بۆ لای خوای پـەروەردگار بـۆ داوا کردنـی پێداویسـتیەکان و لـێ خۆش بوون و داوای بە فریاکەوتن لێیان، وە سوربە لەسەر داواکاریەکانت بۆ ئەوەی بە بەرەکەتی ئەوان جوابت بدرێتـەوە، وە گومـانی باشـت بـەم کـارە هـەبێت..... چـونکە ئەمانە گەورەو بەڕێزن، وە کەسی بەڕێزیش داواکاری ئەمانە ڕەت ناکاتەوە کـە داوایـان لێ دەکەن و تەوەسولیان پێ دەکەن و پشتیان پێ دەبەستن....

بەڵام زیارەتی گەورەی یەکەمینەکان و کۆتاییـەکان صـەڵات و سـەلامی خـوای لـێ بێـت ئـەوە هـەموو ئەوانـەی کـە بـاس کـران چـەند جـارە دەبنـەوە، مەبەسـتم خـۆ شکاندنەوەو زەلیلی نواندن و دەربڕینـی هەژاریـە.... وە هـەر کەسێك تەوەسـولی پـێ بکات یان داوای بە فریاکەوتنی لێ بکات یان هەر پێداویستیەکی خۆی داوا بکات، ئـەوا هیچی ڕەت ناکرێتەوەو ئەو کەسە بێ ئومێد نابێت)، تا ئـەو شـوێنەی کـە دەڵێـت: (وە هەر کەسێك بیرو باوەڕو عەقیدەی پێچەوانەی ئەوە بێت، ئەوە مەحروم بووە لە هەموو ئەمانە)[3].

ئەمە حاڵی ئەم جۆرە کەسانە بوو کە بینیتـان، بـەم شـوبهەیە دەسـتیان پـێ کـرد کـە پێغەمبـەران سـەلامی خوایـان لـێ بێـت ژیـانی بـەردەوام و تـەواویان هەیـە لـەناو گۆڕەکانیـان، وە پاشـان گەیـشتنە ئـەوەی کـە پاڕانـەوەو داوای بـە فریـا کـەوتن و

(١) شفاء الفؤاد (ص٧٩).

(٢) لە بەشەکانی داهاتودا بە پشتیوانی خوای گەورە بە ڕوونی باسی (الوسیلة) دەکەین.

(٣) شفاء الفؤاد (ص٩٧-٩٨).

تەوەسول پێ کردنیشیان دروستە، کە ئەمەش مەبەستی سەرکیانە لەم هەموو هات و هاوارو دوبارە کردنەوەو درێژ کردنەوەی قسەکانیاندا، وە کۆمەڵێك فەرمودەش وەك بەڵگە دەهێننەوە بەوەی کەوا پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت ژیانیان بەردەوامەو زیندوون.

وە پشت بە خوای گەورە لە بەشی داهاتودا ئەم فەرمودانەی کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی دەیکەن بە بەڵگە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن و بڵێن پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت زیندوون و نەمردوون، شەرح و لێکدانەوەی دروستیان بۆ دەکەین و تەخریجی فەرمودەکانیش دەکەین تا بزانین ئایا صەحیحن یان نا؟

بەڵام پێش ئەوەی بێینە سەر بابەتەکەو وەڵامی شوبهەکانیان بدەینەوە، با بزانین ڕۆحی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لە کوێیە؟

ابن رجب ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (هیچ گومانی تیادا نیە کە ڕۆحی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لە لای خوای گەورەیە لە پلە بەرزەکاندا).

وە بە صەحیحی هاتووە کە کۆتا وشەیەك کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی مردنیدا وتویەتی: (اللهم الرفيق الأعلى و كررها حتى قبض)[1].

وە هەروەها پیاوێك بە (ابن مسعود)ی وت: (پێغەمبەر ﷺ مرد، ئەی ئێستا لە کوێیە؟ ئەویش وتی: لە بەهەشتە)[2].

کەواتە لەمەوە بۆمان دەرکەوت کە پێغەمبەرانیش مردوون و کۆتایی بە ژیانی دونیایان هاتووەو ئێستا لە بەرزەخ دان و لە نازو نیعمەت دان، بە پێچەوانەی ئەوانەی کە دەڵێن ژیانی پێغەمبەران لە بەرزەخدا هەر وەك ژیانی دونیایان وایەو مردنیان لەسەر لابراوە.

---

(١) صحيح: رواه البخاري ٨/١٥٠/ح٤٤٦٣)، ومسلم (٢٤٤٤).

(٢) أحوال القبور (ص١٢٤).

هەروەك پێشتر وتمان ئـەم پیـاوەو هاوشـێوەكانی چـەند فەرمودەیـەك دەكـەن بـە بەڵگـە بـۆ سـەلماندنی بیدعـەكانیان، ئەمـەش پـاش ئـەوەی كـە مانـای ڕاسـتەقینەی فەرمودەكانیان گۆڕی و بە شێوازێك لێكیان دانەوەو تەئویلیان كردن تا كۆك بن لەگـەڵ بیرو بۆچونە بەتاڵ و هەڵەكانیان، كە ئەمەش لێكدانەوەیەكە كە بە هیچ شێوەیەك ئـاوا لێـك نەدراونەتـەوە، بـەڵكو هـەموو ئەوانـەی كـە صـەحیحن مـوافیقن لەگـەڵ ئایـەت و فەرمودەكانی تردا.

**<u>فەرمودەی یەكەم:</u>** (إن الله عز وجل حرم على الأرض أن تأكل أجساد الأنبياء)[1].

**لێكدانەوەی فەرمودەی یەكەم:**

ئـەم فـەرمودە پـیرۆزە بەڵگەیـە لەسـەر ڕێـز لێنـانێكی گـەورە كـە خـوای گـەورە لـە پێغەمبەرانی ناوە سەلامی خوایان لێ بێت بەوەی كە لاشـەكانیان بپارێزێت لـە ڕزیـن و شـی بونـەوە لـە دوای مردنیـشیان، وە ئەمـەش پێـچەوانە نیـە لـە گـەڵ مـردن كـە ڕۆحەكەیان لـە لاشـەیان جیـا بۆتـەوە، هـەروەك چـۆن مانـەوەی ڕۆحـەكانیان لـە نـازو نیعمەتدا پێچەوانە نیە لەگـەڵ مردنـی خاوەنەكـەی، وە ئەمـەش تـەنها تایبـەت نیـە بـە پێغەمبەرانەوە سەلامی خوایان لێ بێت.

هەروەك جابری كوڕی عبـدالله ڕەزای خـوای لـێ بێـت دەگێڕێتـەوە كـە كاتێـك باوكیـان دەرهێنایەوە لە گۆڕەكـەی دوای تێپـەڕ بـوونی شـەش مـانگ بەسـەر شـەهید بوونیـداو دەڵێت: (لاشەكەی وەك ئەو ڕۆژە وابوو كە خرابۆ ناویەوە تـەنها گـوێی نـەبێت)، وە لـە

(١) صحيح: رواه أحمد (٨/٤)، وأبو داود (٦٣٥/١)، والنسائي (٩١/٣)، وابن ماجه (٣٤٥/١)، وابن خزيمة (١١٨/٣)، زابن حبان (موارد: ح٥٥٠)، والحاكم (٢٧٨/١). كلهم من طريق حسين الجعفي عن عبدالرحمن بن يزيد بن جابر عن أبي الأشعث الصنعاني عن أوس بن أوس ﷺ عن النبي ﷺ. والحديث رجاله ثقات، وصححه ابن خزيمة وابن حبان والحاكم والنووي في الأذكار (ص٩٧) وابن القيم في جلاء الأفهام (ص٣٢-٣٨) وابن عبدالهادي في الصارم المنكي (ص١٩٩) والألباني في الإرواء (٣٤/١).

ڕیوایەتێكی تردا دەڵێت: (هیچ شوێنێك لە لاشەی تێك نەچوبو تەنها چەند تاڵە مویەك نەبێت لە ڕیشی كە زەوی كاری تێكردبوو)[١].

كەواتە لاشەی شەهیدانیش هەر بە تەڕی دەمێنێتەوە[٢]، وە ئەمەش پێچەوانە نیە لەگەڵ مردنیان و گواستنەوەیان لە ژیانی دونیاوە بۆ ژیانێكی تر، وە پێغەمبەرانیش بە هەمان شێوە، وە هەر بۆیەش شەرع دایناوە كە دەبێت لاشەیان بشاردرێتەوەو لە ژێر خۆڵ دابن.

**<u>فەرمودەی دووەم:</u>** (الأنبياء أحياء في قبورهم يصلون)[٣].

**لێكدانەوەی فەرمودەی دووەم:**

مەبەستی ئەم فەرمودەیەش ژیانی بەرزەخە، وە ڕۆحەكانیشیان لە پلە هەرە بەرزەكاندان، وە ابن رجب دەڵێت:

(هەندێ لاشە بە بەردەوامی دەمێنێتەوە وەك لاشەی پێغەمبەران، بەلاَم لە هەمان كاتدا ڕۆحەكان لە لاشەكان جیا دەبنەوە).

وە هەروەها پێشەوا ابن القيم ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (وە شتێكی زانراوە كە لاشەی پێغەمبەر ﷺ هەر بە تەڕی لە زەویدا ماوەتەوە، بەلاَم گومانیشی تیادا نیە كە ڕۆحی پیرۆزی لای خوای پەروەردگارە لە پلە بەرزەكاندا لەگەڵ ڕۆحی پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت).

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٢١٤/٣)، وأبو داود (٥٦٦/٣).

(٢) وە هەندێ لە زانایان دەڵێن: لاشەی شەهید تا ماوەیەكی دیاری كراو دەمێنێتەوە، وە یان مانەوەشی پەیوەستە بە نیەت و حاڵی شەهیدەكەوە. بڕوانە : (شرح العقيدة الطحاوية) لاپەڕە ٤٦٣.

(٣) صحيح: رواه البزاز (كشف الأستار ١٠١/٣) وأبو يعلى (١٤٧/٦)وابن عدي في الكامل (٧٣٩/٢).
كلهم من طريق المستلم بن سعيد عن الحجاج بن أبي زياد عن ثابت البناني عن أنس ﷺ عن النبي ﷺ. وصححه البيهقي كما ذكر الحافظ في الفتح (٤٨٧/٦) وسكت هو عليه، وحسنه السيوطي في الجامع الصغير وصححه المناوي في شرحه. انظر فيض القدير (١٨٤/٣). وصححه الألباني في السلسلة الصحيحة (ح٦٢١). وقال الهيثمي في المجمع (٢١٤/٨): رجال أبي يعلى ثقات.

ئەمەیـە تێگەیـشتنی ڕاسـت نـەك وەك ئـەم پیـاوەو هاوشـێوەكانی دەڵـێن: (ڕۆحـی پێغەمبەران لە دوای مردنیان جیا نابێتەوە، بەڵكو بۆ لاشەكە دەگەڕێتەوەو لەو لاشـەیە دەرناچێت كە ناڕزێت).

**فەرمودەی سێیەم:** (مررت على موسى ليلة أسري بي عند الكثيب الأحمر وهو قائم يصلي في قبره)[1].

**فەرمودەی چوارەم:** (رأيتني في جماعة من الأنبياء فإذا موسى عليه السلام قائم يصلي، فإذا رجل ضرب جعد كأنه من رجال شنوءة، وإذا عسى بن مريم عليه السلام قائم يصلي، أقرب الناس به شبها عروة بن مسعود الثقفي، وإذا ابراهيم قائم يصلي، أشبه النـاس بـه صاحبكم)[2].

**لێكدانەوەی فەرمودەی سێیەم و چوارەم:**

وە بینـینی پێغەمبـەرانیش سـەلامی خوایـان لـێ بێـت لـە لایـەن پێغەمبـەرەوە ﷺ لـە شەوی میعراجداو لە جێگای خۆیـان لـە ئاسمانـەكان ئـەوە بینـینی ڕۆحـەكانیان بـووە، بەڵام لاشـەكانیان ئـەوە بـێ گومـان لـەناو زەویـدان، وە ئـەم ڕۆحـەش پەیوەنـدی بـە لاشەكەوە ماوە، وە نوێژ كردنیشیان لەناو گۆڕەكانیاندا بە هۆی ئەم پەیوەندیەوەیە.

وە هەروەها ابن القيم دەڵێت: (وە ڕۆحی پێغەمبەر ﷺ بەردەوام لە پلە بەرزەكانە لای خـوای گـەورە، وە خـوای گـەورە دەیگێڕێتـەوە بـۆ نـاو گۆڕەكـەی بـۆ وەڵام دانـەوەی سەلامی ئەوانەی كە سەلامی لێ دەكەن)[3].

وە هەروەها شێخی ئیـسلام ابن تەیمیـە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت دەربـارەی نوێـژی پێغەمبەران سـەلامی خوایـان لـێ بێـت لـەناو گۆڕەكانیانـدا دەڵێـت: (وە ئـەم نوێژانـەو

---

(١) صحيح: رواه مسلم (ح٢٣٧٥)من حديث أنس ﷺ عن النبي ﷺ.

(٢) صحيح: رواه مسلم (ح١٧٢) من حديث أبي هريرة مرفوعاً.

(٣) الروح (ص١٤٧).

هاوشێوەکانیان لەو شتانەن کەوا مردوو چێژی لێ وەر دەگرێت و بەهۆیەوە دەکەوێتە ناو نازو نیعمەتەوە، هەروەك چۆن ئەهلی بەهەشت چێژ لە تەسبیحات وەرْدەگرن)[١].

**فەرمودەی پێنجەم:** (ما من أحد يسلم عليَّ إلاّ رد الله عليَّ روحي حتى أرد عليه السلام)[٢].

**لێکدانەوەی فەرمودەی پێنجەم:**

وە دەربارەی ئەم فەرمودەیەش کە دەفەرموێت: (رد الله عليَّ روحي) ئەوەی لێ وەرناگیرێت کە مردنی کۆتایی هاتووەو گەڕاوەتەوە بۆ ناو ژیانی ئاسایی خۆی، هەروەك ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی گومان دەبەن، بەڵکو ئەمە وەکو ئەم فەرمودەیە وایە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (فتعاد روحه في جسده فيأتيه ملكان فيجلسانه فيقولان من ربك؟)، وە ئەم گەڕانەوەی ڕۆحەش کۆتایی بە مردن ناهێنێت لەو کەسە مردوەداو ئەوەشی لێ وەرناگیرێت کە بگەڕێتەوە بۆ ژیان، ئەویش بە هەمان شێوە ڕۆحەکەی بۆ دەگێڕدرێتەوە بۆ وەڵام دانەوەی سەلامەکە.

وە هەروەها هەمان ئەو بەشەی فەرمودەکە پێچەوانەیە لەگەڵ قسەی ئەم پیاوەدا کە دەڵێت: (و روحه لا تفارقه أبداً)، بەڵکو ماناکەی ئەوەیە کە ڕۆحەکە جیا دەبێتەوەو پاشان دەگەڕێتەوە بۆ وەڵام دانەوەی سەلامەکە، کە ئەمەش مانای ڕوون و ئاشکرای فەرمودەکەیە.

وە هەروەها کە دەشڵێت: پێغەمبەر ﷺ ژیانێکی ئاسایی و تەواو لەناو گۆڕدا بەسەر دەبات، بەڕاستی ئەمە زۆر دوورە لە ڕاستیەوە، چونکە بەڕاستی ئەمە کەم کردنەوەیە لە پلەو پایەو کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئەوەی چۆن عەقڵی کەسێکی تێگەیشتوو ئەوە قەبوڵ دەکات کە پێغەمبەر ﷺ ژیانێکی ئاسایی و تەواو بەسەر ببات

---

(١) مجموع الفتاوى (٣٣٠/٤)، بەڵام شێوەی نوێژ کردنەکەیان شتێکی غەیبیەو تەنها خوای گەورە ئەیزانێ. (م.عبدالكريم).

(٢) صحيح: رواه أحمد (٥٢٧/٢)، وأبو داود (٥٣٤/٢)، كلاهما من طريق أبي صخر حميد بن زياد بن يزيد بن عبدالله بن قسيط عن أبي هريرة ﷺ عن النبي ﷺ وصححه الألباني في (السلسلة الصحيحة) (٢٢٦٦).

هەروەك پێش مردنی، وە لە هەمان کاتیشدا ئەم ژیانەی لە ژێر خاکدا بێت؟! ! کەچی هەموو خەڵکیش خۆشی لە ژیان ببینن و لەسەر زەوی بژین، پێغەمبەریش ﷺ لە ژێر زەویدا بێت و لە حاڵەتی ژیانێکی تەواویشدا بێت هەروەك ئەو ژیانەی کە خەڵکی سەر زەوی تیایدان؟! !

وە ئەم قسەیەش پێچەوانەیە لەگەڵ هەموو ئەو دەقانەی کەوا باس لە مردنی پێغەمبەر ﷺ دەکەن و ئەوە دەردەبڕن کە ڕۆحەکەی لە لاشەی جیا بۆتەوە.

**<u>فەرمودەی شەشەم:</u>** (من صلى عليَّ عند قبري سمعته، ومن صلى عليَّ نائياً أبلغته)[1].

وە فەرمودەی شەشەمیش وەك لە تەخریجەکەیدا دەردەکەوێت کە هیچ بنچینەیەکی نیە، بۆیە هەر پێویست بە ڕوون کردنەوە ناکات.

(١) ضعيف (موضوع): رواه العقيلي في الضعفاء (١٣٦/٤) من طريق محمد بن مروان السدي عن الأعمش عن أبي صالح عن أبي هريرة ﷺ مرفوعاً، وايضا قاله إمامنا الألباني (رحمه الله) في(ضعيف الجامع)(٥٦٧٠).

هەموو ئەو بەڵگانەی پێشوو كە باس كران و ئەو وتانەش كە هێنرانەوە، پشت ئەستورو كۆكن لەگەڵ بەڵگە ڕوون و ئاشكراكانی تر لە قورئانی پیرۆزو فەرمودە صەحیحەكانی پێغەمبەر ﷺو هەموو ئەو بەڵگە شەرعیانەی تریش كە هەن، وە هەروەها بە هەست كردن و عەقڵیش ئەوە دەسەلمێنرێت كە هەموو كەسێك دەمرێت و نكۆڵی لەوە ناكرێت، وە لە ناویشیاندا پێغەمبەران و نێردراوانی خوای گەورە سەلامی خوایان لێ بێت، وە بەڵگە شەرعیەكانیش:

## یەكەم: قورئانی پیرۆز: هەندێكیان گشتین وەك:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ ﴾[1]، واتە: (هەموو نەفسێك دەبێت بمرێت و كۆتایی بە ژیانی بێت).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾[2]، واتە: (ئەو خوایەی كە زیندووی كردن و ژیانی بە بەردا كردن، پاشان دەتان مرێت و پاش ئەوەش زیندووتان دەكاتەوە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ﴾[3]، واتە: (هەموو ئەوانەی كە لەسەر زەویدان لە جنۆكەو مرۆڤەكان و گشت زیندەوەران هەموویان دەمرن ونامێنن).

وە هەروەها لەو بەڵگانەی تریش كە تایبەتن، وەك:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ ﴾[4]، واتە: (ئایا ئێوە ئامادە بوون كاتێك (یەعقوب) لەسەرە مەرگ دابوو خەریكی مردن بوو).

---

(١) سورة آل عمران: (١٨٥).

(٢) سورة الحج: (٦٦).

(٣) سورة الرحمن: (٢٦).

(٤) سورة البقرة: (١٣٣).

وە هەروەها لەسەر زمانی ئیماندارانی ئالی فیرعەون دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ﴾[1]، واتە: (وە بەڕاستی (یوسف)یان بۆ هات لە پێشتردا کە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای پێ بوو بەڵام ئێوە هەر گومانتان هەبوو دەربارەی ئەوەی کە هێناویەتی، وە کاتێکیش کە مردو کۆچی دوایی کرد دڵخۆش بوون و وتتان ئیتر لێرە بە دواوە خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێك نانێرێت).

وە هەروەها لەسەر زمانی ابراهیم خلیل سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾[2]، واتە: (ئەو خوایەی کە دەم مرێنێت و پاشان زیندووم دەکاتەوە).

وە هەروەها دەربارەی سلێمان سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ﴿ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ﴾[3]، واتە: (کاتێك بڕیاری مردنمان دا بۆ سولەیمان و مراندمان هیچ کەس لە جنۆکەکان نەیانزانی کە مردووە ئەگەرچی بانگەشەی ئەوەشیان دەکرد کە غەیب دەزانن، وە ئەویش بە مردوویی بەسەر گۆچانەکەیدا وەستابوو تا ئەو کاتەی کە موریانە گۆچانەکەیان کلۆر کردو سولەیمان کەوتە خوارەوە ئنجا زانیان کە مردووە).

وە هەروەها دەربارەی یحیی سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَيْهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَوْمَ يُبْعَثُ حَيًّا ﴾[4]، واتە: (سەلامەتی خوا لەسەر یەحیا بێت لەو

---

(١) سورة غافر: (٣٤).

(٢) سورة الشعراء: (٨١).

(٣) سورة سبأ: (١٤).

(٤) سورة مريم: (١٥).

ڕۆژەدا کە لە دایك بووە، وە لەو ڕۆژەدا کە دەمرێت، وە لەو ڕۆژەشدا کە زیندوو دەکرێتەوە).

وە هەروەها دەربارەی عیسی سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوۡمَ وُلِدتُّ وَيَوۡمَ أَمُوتُ وَيَوۡمَ أُبۡعَثُ حَيّٗا ﴾[1]، واتە: (سەلامەتی خوام لەسەر بێت لەو ڕۆژەدا کە لە دایك بووم، وە لەو ڕۆژەشدا کە دەمرم، وە لەو ڕۆژەشدا کە زیندوو دەکرێمەوە).

وە هەروەها دەربارەی عەبدو کۆتایی پێغەمبەرانی، پێغەمبەرمان محمد ﷺ دەفەرموێت: ﴿ إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴾[2]، واتە: (تۆ دەمریت و ئەوانیش دەمرن).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴾[3]، واتە: (وە هیچ کەسێك لە پێش تۆداو لەسەر زەوی ژیانی هەتاهەتایی بۆ نەماوەتەوە، بۆ ئایا تۆ دەمریت و ئەوان بۆ هەتاهەتایی لە دونیادا دەمێننەوە؟ هەموو نەفسێك دەبێت بمرێت و کۆتایی بە ژیانی بێت، وە ئێمە بۆ خۆشی و ناخۆشیەکان تاقیتان دەکەینەوەو لە داهاتووش هەر بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ ﴾[4]، واتە: (محمد ﷺ تەنها پێغەمبەرێکەو لە پێش ئەویشدا پێغەمبەرانی زۆر هاتوون، وە ئەگەر مرد یان کوژراو شەهید بوو ئەوا ئێوە لە دینەکەتان هەڵمەگەڕێنەوەو سارد مەبنەوە لەسەری).

---

(١) سورة مريم: (٣٣).

(٢) سورة الزمر: (٣٠).

(٣) سورة الأنبياء: (٣٤ – ٣٥).

(٤) سورة آل عمران: (١٤٤).

## دووەم: بەڵگەکان لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ:

١. لە (ابن عباس)ەوە ڕەزای خوایان لێ بێت کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (اللهم أعوذ بعزتك لا إله إلاّ أنت، أن تضلني، أنت الحي لا يموت، والجن والإنـس يموتـون)[1] ، واتە: (خوایە گیان پەنا دەگرم بە عیزەتی تۆ کە هیچ پەرستراوێکی بە حەق نیـە جگـە لە تۆ، لەوەی کە گومڕام بکەی، وە تۆ ئەو کەسەی کە زیندووی و هـەرگیز نامریـت، وە جنۆکەو مرۆڤەکان دەمرن).

وە لەمەوە بۆمان دەردەکـەوێت کـە پێغەمبـەران و نێـردراوانیش دەکەونـە نـاو بازنـەی (الإنس)ەوە، وە پێغەمبەر ﷺ هیچ کەسێکی لێ جیا نـەکردەوە، کەچـی ئـەم پیـاوەو هاوشێوەکانی وا گومان دەبەن کە پێغەمبەران سـەلامی خوایـان لـێ بێـت تـا ئێـستاش زیندوون!!!

٢. وە هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا دەفـەرموێت: (كانت بنو اسـرائيل تـسوسهم الأنبياء، كلما هلك نبي خلفه نبـي)[2] ، واتـە: (بـەنو ئیـسرائیل پێغەمبـەران بـەڕێوەیان دەبردن و سیاسەتیان بەکار دەهێنا، هەر کاتێك پێغەمبەرێك دەمـرد پێغەمبـەرێکی تـر لە دوای دەهات).

ئەمەش بەڵگەیـەکی حاشـا هەڵنـەگرە لەسـەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەرانیش سـەلامی خوایان لێ بێت مردنیان بەسەردا دێت و دەمرن و وەك هـەر تـاکێکی تـر لـە مرۆڤـەکان کۆتایی بە ژیانیان دێت و جیا نەکراونەتەوە لە هیچ مرۆڤێك.

٣. وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی تردا دەفـەرموێت: (إن الله عزوجل إذا أراد رحمة أمة من عباده قبض نبيها قبلها فجعله لها فرطاً وسـلفاً بـين يـديها، وإذا أراد هلكة أمة عذبها ونبيها حي فأهلكها وهو ينظر فأقر عينـه بهلكتهـا حـين كـذبوه وعـصوا

(١) صحيح: رواه البخاري (٣٦٨/١٣)، ومسلم (٢٧١٧).

(٢) صحيح، رواه البخاري (٤٩٥/٦)، ومسلم (ح١٨٤٢).

أمره)[1] ، واتە: (ئەگەر خوای گەورە ڕەحمەتی بۆ ئوممەتێك بویستبایە لـە عەبدەکانی ئەوا پێش ئەوان پێغەمبەرەکەی دەمراندو دەیکرد بە پێشەواو پێشینێك بـۆ ئـەوان، وە ئەگەر بیویستبایە ئوممەتێك بە هیلاك ببـات ئـەوا عـەزابی دەدان و پێغەمبەرەکەشـیان زیندوو دەبوو بە چاوەکانی خۆی بـە هـیلاك چـوونی ئـەوانی دەبـینی کاتێـك ئـەوان بـە درۆیان دەزانی و سەرپێچی فەرمانەکانیان دەکرد).

٤. وە هەروەها لە ئەبو هریرەوە ڕەزای خوای لێ بێـت بـە مـەرفوعی هـاتووە کـە: (فریشتەی ڕۆح کێشان هات بۆ لای موسی سەلامی خوای لێ بێت و پێـی ووت: وەڵامـی خوای گەورە بدەرەوە، موسی سەلامی خوای لـێ بێـت لـە فریـشتەی ڕۆح کێـشانی داو چاوی کوێر کرد[2]، پاشان فریشتەی ڕۆح کێشان گەڕایەوە بۆ لای خوای گەورەو وتـی: بەڕاستی تۆ منت نارد بۆ لای بەندەیەکی خۆت بەڵام ئەو نایەوێت بمرێـت، وە چاویـشی کوێر کردم، پاشان خوای گەورە چاوی بۆ گێڕایەوەو پێی وت: بچۆ بۆ لای عەبدەکەم و پێی بڵێ: ئایا ژیانت دەوێـت؟ ئەگـەر ژیانـت دەوێـت ئـەوا دەسـت بخـەرە سـەر پـشتی گایەك، ئنجا چەند موو کەوتە ژێر دەستت بۆ هەر تاڵە مویەك ساڵێك بـژی، ئنجـا مـوس سەلامی خوای لێ بێت وتی: پاشـان چـی ڕوو دەدات؟ وتـی: پاشـان دەمریـت، ئـەویش وتی: کەواتە لە ئێستا زووتر نیە....)[3].

٥. وە پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمودەیـەکی تـردا دەفـەرموێت: (والـذي نفـسي بيـده لوددت أني أقتل في سبيل الله ثم أحيا، ثم أقتل ثم أحيا، ثم أقتل ثم أحيـا، ثـم أقتـل)[4] ، واتە: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، حەز دەکەم لـە پێنـاو خـوای گـەورە

---

(١) صحيح: رواه مسلم (ح٢٢٨٨).

(٢) موسا عليه السلام نەيزانی کە ئەمە فريشتەی ڕۆح کێشانە، چونکە لەسەر شێوەی پياوێك هـاتبوو بـۆ لای موسا. (م.عبدالكريم).

(٣) صحيح: رواه البخاري (٦/٤٤٠)، ومسلم (ح٢٣٧٢).

(٤) صحيح: رواه البخاري (٦/١٦)، ومسلم (ح١٨٧٦).

بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە، دیسان بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە، دیسان بکوژرێم و پاشان زیندوو بکرێمەوە، دیسان بکوژرێمەوە).

لەم فەرمودەیەدا زۆر بە ڕوونی دەردەکەوێت کە ژیان و مردن وەك یەك نین و بەڵکو جیاوازیان هەیە، وە ئەگەر هەردووکیان یەك شت بونایە وەك ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی گومان دەبەن، ئەوا پێغەمبەر ﷺ جیای نەدەکردنەوە، بەڵکو هەردوکیانی بە یەك شت و وەك یەك دادەنا.

٦. وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە بەرامبەر جولەکەکان و دەربارەی موسی سەلامی خوای لێ بێت دەفەرموێت: (ولو كان موسى حياً ما وسعه إلاّ اتباعي)[١] ، واتە: (ئەگەر هاتباو موسی زیندوو بوایە، ئەوا هیچ بوارێکی نەدەبوو تەنها ئەوە نەبێت کە شوێنم بکەوێت).

وە لەم فەرمودەیەشەوە تێ دەگەین کە موسی سەلامی خوای لێ بێت ئێستا مردووە، وە ئەگەرنا ئەوا دەبوو شوێن پێغەمبەر ﷺ بکەوێت، وە ئەمەش بەڵگەیەکی زۆر ڕاشکاوانەیە بەرامبەر بانگەشەی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی.

وە هەروەها لە بەسەرهاتی مردنی پێغەمبەر ﷺ و شڵەژانی هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت و گومان بردنی هەندێکیان کەوا پێغەمبەر ﷺ نەمردووە وەك عمری کوڕی خەتتاب ڕەزای خوای لێ بێت، تا ئەو کاتەی ئەبوبەکری صدیق ڕەزای خوای لێ بێت چوو بۆ سەر مینبەرو وتی: هەر کەسێك لە ئێوە کە (محمد)ی ﷺ دەپەرست ئەوا بەڕاستی (محمد) مرد، وە هەر کەسێکیش خوای گەورەی دەپەرست ئەوا بێ گومان و بە دڵنیاییەوە خوای گەورە زیندووەو هەرگیز نامرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴾[٢].

---

(١) حسن: رواه أحمد (٣٨٧/٣)، والبغوي في شرح السنة (٢٧٠/١)، بإسناد ضعيف لكن له شواهد يتقوى بها. وقد حسنه الألباني في تخريج المشكاة (٦٣/١).

(٢) سورة آل عمران: (١٤٤).

ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئەوەی کەوا پێغەمبەر ﷺ مردووەو کۆتایی بە ژیانی هاتووە، وە هەر ئەمەش تێگەیشتنی هاوەڵانە ڕەزای خوایان لێ بێت، نەك بەو شێوەیەی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی لێی تێگەیشتوون، وە هەموو ئەم بەڵگانەش بەسن بۆ کەسێك کە بەڕاستی عەقڵ و هۆشی هەبێت و بە شوێن بەڵگەدا بگەڕێت[1].

---

(١) ئەمەش اجماعی هاوەڵانە ڕەزای خوایان لێ بێت لەسەر مردنی پێغەمبەر ﷺ و کەسیان بۆچوونی جیاوازی نیە. (م.عبدالکریم).

# بەندی شەشەم:

## بەشی یەکەم

## سەردانی قەبران و سەفەر کردن و ڕۆیشتن بۆ لایان

## بەشی دووەم

## هەڵسەنگاندنی ئەم فەرمودانەی کە دەربارەی سەردانی گۆڕستان دەیان هێننەوە

## بەشی سێیەم

## دروست نیە سەفەر کردن بۆ سەردانی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ

# بەشی یەکەم:

# سەردانی قەبران و سەفەر کردن و ڕۆیشتن بۆ لایان

یەکێ لە گەورەترین فێڵ و تەڵەکەکانی شەیتان لە بەرامبەر خەڵکی بریتی بووە لـە (فیتنەی قەبر)، کە هەر لە کۆنەوەو تـا ئێستاشی لەگـەڵ بێـت وەسوەسـەی خستۆتە دڵی خەڵکەوەو شوێن کەوتوانی خۆی زیاد دەکات بـەوەی کـە گـۆڕی پیـاو چـاکان بـە گـەورە بزانرێـت و بایـەخی زۆری پـێ بـدرێت و مزگـەوتی لەسـەر دروسـت بکرێـت، وە هەروەها وای لە خەڵکی کردووە کە لە جیاتی خوای گـەورە پـشتیان پـێ ببەسـترێت و داوای کۆمەك و یارمەتی و بە فریا کەوتنیان لێ بکرێت. وە بـەم هۆیەشـەوە خـەڵکێکی زۆری گومڕا کردووەو شوێنی کەوتون و گەیاندونیەتە ئەو ئاستەی کە بیپەرستن.

وە ئـەم فێڵـەی شـەیتان بـەردەوام بـوو تـا گەیـشتە ئـەوەی کەسـانێك بـەناوی خۆشویستنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ کۆمەڵێك لە سیفەت و ناوە جوانـەکانی خـوای گـەورە بۆ پێغەمبـەر ﷺ دابنێـنن، وە هـەروەها داوای هـەموو ئەو شتانەشـی لـێ بکرێـت کـە دروست نیە لە غـەیری خـوای گـەورە داوا بکرێـت، وە هـەروەها قەبرەکـەی بـە گـەورە بزانرێـت و سـەردانی بکرێـت و نوێـژی لەسـەر بکرێـت و لێـی بپاڕێنـەوەو داوای لـێ خۆشبوون و بە فریا کەوتنی لێ بکرێت.

وە هـەروەها سـەفەری تایبـەت بکرێـت بـۆ سـەردانی گۆڕەکـەی و سـەردان کردنـی بـە هیجرەت دابنرێت بۆ لای خوای گەورە، بۆنمونە ئەم پیاوە دەڵێت: (گومـانی تیـادا نیـە کە هەر کەسێك کەمێك عیلم و زانیاری هەبێت دەزانێت کـە چونە دەرەوە بـۆ سـەردان کردنی پێغەمبەرﷺ، ئەوە هیجرەت کردنە بۆ لای خواو پێغەمبەرﷺ، چونکە سـەردان کردنی لە دوای مردنی وەك سەردان کردنیەتی کە لە ژیاندا بوبێت)[1].

وە بـۆ ئـەم زیادەڕەویەشـیان کۆمـەڵێك فـەرمودەی لاوازو هەڵبەسـتراو دەهێننـەوە دەربارەی فـەزڵ و گـەورەیی سـەردانی گـۆڕی پێغەمبـەر ﷺ، کـە لـە بەشـی داهـاتودا باسیان دەکەین انشاءالله.

---

(١) شفاء الفؤاد (ص٥٥).

بەڵام سەردان کردنی گۆڕستان بە مەبەستی بیرکردنەوە لە مردن و قیامەت و هەروەها بیر کردنەوە لە خۆت کەوا ڕۆژێك دێت تۆش وەك ئەوان دەچیتە ناو گۆڕەوەو کۆتایی بە ژیانت دێت و دوعای خێر کردن بۆ خۆتو مردووی موسوڵمانان دروستەو هیچ ڕێگرێکی تیادا نیە، بە بەڵگەی چەند فەرمودەیەك کە ئێمە تەنها دوو فەرمودە دەهێنینەوە، ئەوانیش:

١. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (كنت نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإنها تذكرة الآخرة)[1] ، واتە: (پێشتر ڕێگەم لێ گرتن لەوەی کە سەردانی گۆڕستان بکەن بەڵام ئێستا سەردانی بکەن، چونکە یاد کردنەوەی ڕۆژی دوایی تیادایە).

٢. وە هەروەها دەفەرموێت: (إني نهيتكم عن زيارة القبور فزوروها فإن فيها عبرة، ولا تقولوا ما يسخط الرب)[2] ، واتە: (پێشتر ڕێگەم لێ گرتن لەوەی کە سەردانی گۆڕستان بکەن بەڵام ئێستا سەردانی بکەن چونکە پەندو ئامۆژگاری تیادایە، وە شتێك مەڵێن کە خوای گەورە تورە بکات).

---

(١) صحيح: أخرجه مسلم (٩٧٧)، والنسائي (٤/٨٩)، وأحمد (٥/٣٥٠).

(٢) صحيح: أخرجه أحمد (٣/٣٨)، والحاكم (١/٣٧٤)، و صححه وقال على شرط مسلم. وأخرجه البزار. انظر مجمع الزوائد (٣/٥٨).

ئەم پیاوە لـە کتـێبی (شـفاء الفـؤاد)دا چـەند فەرمودەیـەك دەنوسـێت دەربـارەی سەردانی قەبری پێغەمبەر ﷺ، وە هەروەها هاوشێوەکانیشی لە زۆر شوێن ئاماژە بەم فەرمودانە دەکەن و وەك بەڵگەیەك بۆ بەهێز کردن و پشتیوانی کـردن لـە بـیرو بـاوەڕو بۆچونە گومڕاکانیان بەکاریان دەهێنن، کە ئەمەش فەرمودەکانن:

**فەرمودەی یەکەم:**

عن ابن عمر مرفوعاً بلفظ:(من حج فزار قبري بعد وفاتي فكأنما زارني في حياتي)[1].

**فەرمودەی دووەم:**

عن ابن عمر مرفوعاً بلفظ: (من زار قبري بعد موتي كان كمن زارني في حياتي)[2].

**فەرمودەی سێیەم:**

عن ابن عمر مرفوعاً بلفظ: (من حج البيت ولم يزرني فقد جفاني)[3].

**فەرمودەی چوارەم:**

عن ابن عمر مرفوعاً بلفظ: (من زار قبري وجبت له شفاعتي)[4].

---

(١)ضعيف (منكر): (شفاء الفؤاد ص١٣). رواه الدار قطني (٢/٢٧٨)، والبيهقي (٥/٢٤٦)، وقال: تفرد به حفص وهـو ضعيف، وايضا قاله إمامنا الألباني (رحمه الله) في(ارواء الغليل)(١١٢٨). وە ابـن عبـدالهادی لـە کتـێبی (الـصارم المنکی) لاپەڕە (٥٥)دا دەڵێت: بزانە کە دروست نیە ئـەم فەرمودەیـە بکرێـت بـە بەڵگەو نابێـت پـشتی پـێ ببەسترێت، چونکە فەرمودەکە (منکر)ەو ئیسنادەکەشی ساقطە.

(٢) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص١٤). رواه الطبراني (١٢/٣٠٩). ابـن عبـدالهادی لـە کتـێبی (الـصارم المنکـی) لاپـەڕە (٦٥)دا دەڵێت: (ئەم ئیسنادە بە هیچ شێوەیەك پشتی پێ نابەسترێت).

(٣)ضعيف (موضوع): (شفاء الفؤاد ص١٧) رواه ابن عدي في الكامل (٧/٢٤٨٠)، قال الـذهبي في الميـزان (٤/٢٦٥) موضوع، وايضا قاله إمامنا الألباني (رحمه الله) في(السلسلة الضعيفة)(٤٥). وە ابن عبدالهادی لە کتێبی (لـصارم المنكي) لاپەڕە (٧٩)دا دەڵێت: (ئەم فەرمودەیە (منکر)ی تەواوەو هیچ ئەصڵ و بنچینەیەکی نیـە، بـەڵکو لـە هەڵبەستراوو مەوضوعەکانە).

(٤)ضعيف (موضوع): (شفاء الفؤاد ص١٨-٢٣). رواه الدار قطني (٢/٢٧٨)، والعقيلي (الضعفاء ٤/١٧٠)، وايضا قاله إمامنا الألباني (رحمه الله) في(ضعيف الجامع)(٥٦٠٧).ابن عبدالهادی لە کتێبی (الصارم المنكـي) لاپـەڕە (١٥)دا دەڵێت: (ئەم فەرمودەیە صەحیح نیەو جێگیر نەبووەو بەڵکو فەرمودەیەکی (منکر)ە لای پێشەواو زانایـان و بە بەڵگە دانانرێت).

**فەرمودەی پێنجەم:**

عن ابن عمر مرفوعاً بلفظ: (من زار قبري حلت له شفاعتي)[١].

**فەرمودەی شەشەم:**

عن ابن عمر مرفوعاً بلفظ: (من جائني زائراً لا تعلمه حاجة إلاّ زيارتي كان حقاً عليَّ أن أكون له شفيعاً يوم القيامة)[٢].

**فەرمودەی حەوتەم:**

عن عمر بن الخطاب مرفوعاً بلفظ: (من زار قبري، أو قال: من زارني كنت له شفيعاً أو شهيداً)[٣].

**فەرمودەی هەشتەم:**

عن حاطب مرفوعاً بلفظ: (من زارني بعد موتي فكأنما زارني في حياتي....)[٤].

**فەرمودەی نۆیەم:**

حديث أبي هريرة عن النبي ﷺ قال: (ما من أحد يسلم عليَّ إلاّ رد الله عليَّ روحي حتى أرد عليه السلام)[٥].

---

(١) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص١٣). رواه البزاز في كشف الأستار (٢/٥٧). وە ابن عبدالهادی لە کتێبی (الصارم المنكی) لاپەڕە (٣٣)دا دەڵێت: (ئەوە فەرمودەیەکی ضە عیف و منکرەو ئیسنادەکەی ساقطە، وە دروست نیە بکرێت بە بەڵگە لای پێشەوایانی فەرمودە).

(٢) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص٢٣-٢٥). رواه الطبراني (ح١٣١٤٩) قال الهيثمي في (المجمع ٢/٤): فيه مسلمة بن سالم، وهو ضعيف. ابن عبدالهادی لە کتێبی (الصارم المنكي) لاپەڕە (٤١)دا دەڵێت: (ئەم فەرمودەیە ئیسنادەکەی چەعیفەو مەتنەکەشی (منكر)ە، دروست نیە بکرێت بە بەڵگەو نابێت پشتی پێ ببەسترێت).

(٣) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص١٧). رواه الطيالسي (ح٦٥)، والبيهقي (٥/٢٤٥) وقال: (هذا إسناد مجهول). ابن عبدالهادی لە کتێبی (الصارم المنكي) لاپەڕە (٨٩)دا دەڵێت: ئەو فەرمودەیە صەحیح نیە بەهۆی پچڕانی سەنەدەکەی.

(٤) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص٦٧). رواه الدار قطني (٢/٢٧٨)، من طريق هارون بن أبي قزعة عن رجل من آل حاطب عن حاطب. ابن عبدالهادی لە کتێبی (الصارم المنكي) لاپەڕە (١٠٢)دا دەڵێت: (ئەم فەرمودەیەش وەك فەرمودەکەی پێشوو وایەو ضە عیفە).

(٥) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص٦٩). رواه الإمام أحمد (٢/٥٢٧) وأبو داود (٢/٥٣٤). پێشتر باسی ئەم فەرمودەیە کراوەو شی کراوەتەوە.

**فەرمودەی دەیەم:**

عن أبي هريرة مرفوعاً بلفظ: (من صلى عليَّ عند قبري سمعته، ومن صلى عليَّ نائياً أبلغته)[1].

ئەمانە بریتی بوون لە كۆمەڵێك فەرمودە كە ئەم پیاوە دەیان كات بە بەڵگە بۆ شەرعیەت دان بەبیدعەو گومڕاییەكەی و وەك چۆن خۆی گومڕا بووە دەیەوێت ئاواش خەڵكی پێ لە خشتە ببات و گومڕایان بكات لە پێناو چەند مەرام و مەبەستێكی تایبەتی خۆیدا، وە هەروەها چەند فەرمودەو ئەثەرێكی تریش هەن كە هەندێكیانی باس كردوون بەڵام بە هەمان شێوە ئەوانیش ضەعیفن و هیچ بنچینەیەكیان نیەو ناكرێت وەك بەڵگە تەماشا بكرێن.

وە لەناو هەموو ئەم فەرمودانەدا كە باسی كردن تەنها ئەم فەرمودەیە (ما من أحد يسلم عليَّ إلاّ رد الله عليَّ روحي حتى أرد عليه السلام) صەحیحە، بەڵام ئەویش نەبوو بە بەڵگە بە دەستیانەوە، بەڵكو بوو بە بەڵگە بەسەریانەوە، بۆیە هەموو قسەكانیان وەك سەرابێكی[2] لێ هات و بە دەست بەتاڵی مانەوە.

وە وەك پێشتریش باسمان كرد كە بە شێوەیەكی گشتی سەردانی گۆڕستان بۆ مەبەستی بیر كردنەوە لە مردن و قیامەت و ترسناكیەكانی ئەم ڕۆژەو سەلام كردن لە ئەهلی گۆڕستان و دوعاو پاڕانەوەو داوای لێ خۆش بوون بۆ كردونیان لە خوای گەورە دروستەو ڕێگە پێدراوە، وە ئەمەش پێغەمبەران و پیاو چاكان و غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین گۆڕی پێغەمبەریش ﷺ لە دوو حاڵەت تێپەڕ ناكات: یان دەخرێتە بازنەی هەموو گۆڕێكەوەو دروستە بەشێوەیەكی شەرعی سەردان بكرێت و سەلامی لێ بكرێت و بیر لە حاڵی خۆت بكەیتەوە كاتێك تۆش دەخرێیتە ناو گۆڕەوە،

---

(١) ضعيف: (شفاء الفؤاد ص١٣٤). رواه العقيلي في الضعفاء (١٣٦/٤). پێشتر باسی ئەم فەرمودەیە كراوەو شی كراوەتەوە.

(٢) سەراب: تیشكێكە كاتی زۆر گەرما لە بیاباندا وەك ئاو دێتە پێش چاوی ڕێبوار.

بەڵام پاڕانەوەو دوعا بۆ کردنی دروست نیە وەك چۆن لەسەر گۆڕستان بۆیان دەپاڕێیتەوە، بەڵکو تەنها صەڵاواتی لەسەر دەدەیت و داوای ئەوە دەکەیت کە خوای گەورە (وەسیلە)ی پێ ببەخشێت وەك لە فەرمودەی صەحیحدا هاتووە کە ئەمە بوترێت لە دوای بانگ.

وە یان گۆڕی پێغەمبەر ﷺ تایبەتەو جیا کراوەتەوە لە نێوان هەموو گۆڕەکانی تردا، کە دروست نیە زیارەت بکرێت ئەوەش لەبەر ئەوەی پێ گەیشتنی زۆر زەحمەتە، چونکە ئەو ﷺ لە ژورەکەی خۆی نێژراوەو بە سێ دیوار دەورە دراوەو وەك گۆڕەکانی تر لەبەر چاو نیەو دیار نیە. پاشانیش کەسێك بیەوێت صەڵاوات و سەلامی لەسەر بدات ئەوا ئەو کەسە لە هەر شوێنێك بێت هەر پێی دەگات.

سەفەر كردن و خۆ ئامادەكردن بۆ سەفەر بە مەبەستی سەردانی قەبری پێغەمبەر ﷺ شتێكی نەهی لێ كراوە، بەهۆی چەند فەرمودەیەكەوە كە بە صەحیحی هاتوون لە پێغەمبەرەوە ﷺ، كە گومان لەمەش دانیە ئەم سەفەر كردنە سەردەكێشێ بۆ شیرك و هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە، لەم فەرمودانەش:

١. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (سەفەرو خۆ ئامادەكرن بۆی ناكرێت تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت: مزگەوتی مەككەو مزگەوتی پێغەمبەرو مزگەوتی ئەقصا)[1].

٢. وە هەروەها دەفەرموێت: (سەفەرو خۆ ئامادەكرن بۆی ناكرێت تەنها بۆ سێ مزگەوت نەبێت: ئەو مزگەوتەی من و مزگەوتی مەككەو مزگەوتی ئەقصا)[2].

٣. وە هەروەها فەرمودەی ابن عمر ڕەزای خوای لێ بێت لە ڕێگەی (قزعە)ەوە دەڵێت: (ویستم بڕۆم بۆ (طور) وە پرسیارم لە ابن عمر كرد، ئەویش وتی: (ئایا نەتزانیوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ..........)[3] فەرمودەكەی بۆ باس كرد.

وە هەموو ئەم فەرمودانە بە ئاشكراو بەو پەڕی ڕاشكاوانە نەهی دەكەن لە سەفەر كردن بۆ جگە لەم سێ مزگەوتە، وە هیچ شوێن و جێگایەكی تر دیاری نەكراوەو جیا نەكراوەتەوە بۆ ئەوەی سەفەرو خۆ ئامادەكردنی بۆ بكرێت، وە ئەگەر نەهی بێجگە لەم سێ مزگەوتە كرابێت كە مزگەوتماڵی خوایە بۆ عیبادەت كردن و بە پیرۆز دانانی، ئەوا خۆ ئامادەكردن و سەفەر كردن بۆ سەردانی گۆڕو مەنزڵگای پێغەمبەران و پیاو چاكان لەولاترە كە ئەم نەهی كردنە بیگرێتەوە.

وە هەروەها جگە لەم فەرمودانەش كۆڕای هاوەڵان و شوێن كەوتوانیان (اجماع الصحابة والتابعين) لەسەر ئەوەیە كە سەفەر كردن بۆ سەردان و زیارەتی گۆڕستان یان هیچ گۆڕێك بە تایبەت دروست نیە، چونكە هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە كە یەكێك لەوان

---

(١) صحيح: أخرجه البخاري (٥١/٣)، ومسلم (١٣٩٧).

(٢) صحيح: أخرجه البخاري (٥٧/٣)، ومسلم (٨٢٧).

(٣) صحيح: أخرجه الأزرقي في أخبار مكة (ص٣٠٤)، كما في الإرواء (٢١٣/٣)، قال الألباني إسناده صحيح.

سەفەری کردبێت بۆ سەردان و سەفەر کردن بۆ زیارەتی هیچ گۆڕێك، نە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و نە گۆڕی هیچ کەسێکی تر، وە ئەگەر ئەمە شتێکی دروست بوایە ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەوان ئەنجامیان دەدا، وە گومانیشی تیادا نیە کە هیچ کەسێك هێندەی ئەوان سور نەبوون لەسەر عیبادەت و کاری چاکە بۆ نزیك بونەوە لە خوای پەروەردگار، بۆیە دەتوانین بڵێین کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی هیچ بەڵگەیەکی صەریح و صەحیحیان پێ نیە بۆ ئەوەی لەم بوارەدا پشتی قسەکانی خۆیانی پێ بگرن.

وە شێخی ئیسلام (ابن تەیمیە) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (قەبری ابراهیم خلیل سەلامی خوای لێ بێت لە شامە، وە هیچ هاوەڵێك سەفەری نەکردووە بۆ ئەوەی زیارەتی بکات، لە کاتێکدا ئەوان هاتوون بۆ (بیت المقدس)و نوێژیان تیادا کردووە، کەچی نەچوون بۆ سەردان و زیارەتی قەبری ابراهیم خلیل سەلامی خوای لێ بێت).

وە هەروەها دەڵێت: (وە هەورەها هیچ هاوەڵێك سەفەری بۆ مەدینە نەکردووە تەنها لەبەر سەردان کردن و زیارەتی قەبری پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو چوون سەردانی مزگەوتەکەیان کردووەو نوێژیان تیادا کردووەو سەلامیان لێ کردووە لە نوێژداو صەڵاواتیان لەسەر لێداوە)[1].

وە لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی تەنها لە بواری سەردانی گۆڕستان و سەفەر کردن بۆی پێچەوانەی کۆڕای زانایان و موسڵمانانیان نەکردووە، بەڵکو لە گەورەترین و ترسناکترین بواردا پێچەوانەیان کردووە، کە ئەویش جگە لە سەردان و سەفەر کردنی تایبەت بۆ سەر گۆڕی پیاو چاکان و پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت، بەڵکو خاوەنی گۆڕەکانیش دەکەن بە هاوبەش و شەریکی خوای گەورەو لێیان دەپاڕێنەوەو داوای یارمەتی و بە فریاکەوتن و دابین کردنی پێداویستیەکانیان و لابردنی گرفت و ناڕەحەتیەکانیان و لێ خۆش بوون لە گوناهو

(١) مجموع الفتاوى (٢٧/١٨٠) الطبعة المحققة.

تاوانەكانیان لیَ دەكەن، وە هەر بەوەش واز ناهێنن بەڵكو بانگـەوازی بـۆ دەكـەن و بـە هۆیانەوە خەڵكانێكی زۆریش وەك خۆیان گومڕا دەكەن و هانیـان دەدەن بـۆ شـەریك و هاوەڵ دانان بۆ خوای تاك و تەنهاو باڵا دەست، خوای گەورە هەموو لایەكمان بپارێزێت لە شەڕو فێڵ و تەڵەكەكانیان.

# بەندی حەوتەم:

# تەوەسول (التوسل)

بەشی یەکەم

تەوەسول لە دیدی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانیەوە

بەشی دووەم

مانای تەوەسول و وەسیلە

بەشی سێیەم

جۆرەکانی تەوەسول

یەکەم: تەوەسولی شەرعی (ڕێگە پێدراو).

دووەم: تەوەسولی ناشەرعی (ڕێگە پێ نەدراو).

بەشی چوارەم

شوبهەکانی ئەم پیاوەو هاوشێەکانی لە تەوەسولی ڕێگە پێ

نەدراوو ناشەرعیدا.

لە گەورەترین ئەو شوبهەو گومانانەی کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی بە ڕووی خەڵکیدا دەدەن و پەنای بۆ دەبەن بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم شیرك و گومڕاییەی کە لە سەری دەڕۆن، بریتیە لە بابەتی تەوەسول کردن بە پێغەمبەران و پیاو چاکان، بەو مانایەی کە دەیان کەن بە ناوەندو شەفاعەتکارو نزیك بونەوە بە هۆیانەوە لە خوای گەورە، هەر بەو شێوەیەی کە موشریکە کۆنەکان دەیان کردو ئەنجامیان دەدا.

وە لە پێناو ئەم کارەشیاندا هەستاون بە گۆڕینی مانای ڕاستەقینەی ئەو دەقانەی کە لەسەر تەوەسولی شەرعی هاتوون، وە بە شێوەیەکی هەڵە ڕاڤەو تەفسیری بۆ دەکەن، بە پێچەوانەی ئەو مانا ڕاستەقینەی کە دەقەکە هەیەتی.

ئەم پیاوە دەڵێت: (لە گەورەترین عیبادەت و هۆکارەکانی نزیك بونەوەی ئەو کەسەی کە سەردانی گۆڕی پێغەمبەر ﷺ دەکات و دڵی پێ خۆش دەبێت، بریتیە لە تەوەسول کردن بە پێغەمبەر ﷺ، چونکە بە ڕاستی تەوەسول کردن بە پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەویش لە پێغەمبەران و پیاو چاکان دروستەو بەڵکو سوننەتیشە، کە ئەمەش مانای پاڕانەوەو داوا کردنە لە خوای گەورە بەو جاهو پیرۆزیەی کە ئەوان هەیانە، وە ڕوو کردنە خوای گەورەیە بە هۆی ڕێزو حورمەتی ئەوانەوە).

پاشان ئەم ئایەتە دەکات بە بەڵگە کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾[1]، واتە: (ئەی ئەوانەی کەوا ئیمانتان هێناوە تەقوای خوای گەورە بکەن و لێی بترسن، وە لێی نزیك ببنەوە بە عیبادەت و کردەوەی چاك، وە لە پێناویشیدا تێبکۆشن و هەوڵ بدەن بەڵکو سەرفرازو سەربەرزبن).

کەچی ئەو ماناکەی دەگۆڕێت و دەڵێت: (وە مەبەستی وەسیلە بۆلای خوای گەورە بریتیە لە تەوەسول کردن بە هەر شتێك کە مایەی لێ نزیك بونەوەیەتی، جا بە هۆی

(١) سورة المائدة: (٣٥).

کردەوەوە بێت یان بە هۆی کەسانی خاوەن جاهو پلەو پایەو باڵاوە بێت)[١].

بینیتان کە تەنها بە تەوەسول کردن بە پێغەمبەرەوە ﷺ نەوەستا، بەڵکو لەویشی تێپەڕاند بۆ پیاو چاکان و کەسانی خاوەن جاهو پلەو پایە، کە گومانی تیادا نیە وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا لەو کارانەیاندا تەنهاو تەنها مەبەستیان زیادەڕەوی کردنە لە خودی خۆیانداو دەیانەوێت خۆیان بە یەکێك لەو خاوەن جاهو پلەو پایانە لە قەڵەم بدەن.

پاشان بەردەوام دەبێت و زیادەڕەوی لەسەر زیادەڕەوی دەکات، چونکە بەوە واز ناهێنێت کە تەوەسول بە مرۆڤێك یان دروست کراوێك بکات بۆ لای خوای گەورەو دروستکار، بەڵکو تەوەسول بە دروست کراوێك (مرۆڤێك) دەکات بۆ لای دروست کراوێك (مرۆڤـ)ێکی تر.

ئینجا ئەم پیاوە هۆنراوەیەکی (عمر الخلوتي) دەهێنێت و بەم شێوەیەش وەصفی دەکات و دەڵێت: (الإمام العارف بالله)!!! کە قسە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکات و لە هۆنراوەکەیدا دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يا ملاذ الورى وخير عيان | ورجاءً لكل دانٍ وقي |
| لك وجهي وجهت يا أبيض الوجه | فوجِّه إليه وجه الـــي |
| أفترضى الرجوع لي مثلما جئتك | صفر اليدين يا ذا الصفي؟ |
| قد توسلت عند بابك بالصديق | والصاحب التقي النقي |
| وبفاروقك الضجيع الذي قد | كنت ترضى بحكمه المرضي |
| وبعثمان ذي الحياء شهيد الدار | من حاز كل وصف بهي |
| وبيعسوبك الإمام علي | قالع الباب في الوغى الخيري[٢] |

(١) شفاء الفؤاد (ص١٥٦).

(٢) الذخائر (ص١٦٦).

سەیركەن تەوەسول بە چوار خەلیفە ڕێنومایی كراوەكان دەكات ڕەزای خوایان لێ بێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و كردویەتی بە پەرستراوی یەكەم لە لای خۆیەوە، وە ئەوانیشی كردووە بە وەسیلەو ناوەندێك و تەوەسولیان پێ دەكات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە ئەوانەی كە (یغوث و یعوق و نسرو لات و عوزاو هوبەل)یان دەپەرست ئاوا جورئەتیان نەكردووەو بەو شێوەیەیان نەوتووە، چونكە هەموو ئەو وەصفانەی كە ئەم شاعیرە نوسیونی و ئەم پیاوەو هاوشێوەكانی بڕوایان پێی هەیەو قەوانەكەی بۆ لێ دەدەنەوە، هەموویان وەصفن بۆ پەرستراوی ڕاستەقینە كە خوای گەورەو باڵا دەستە.

پاشان چەند دێڕێكی تر دەهێنێت كە هی شاعیرێكی تریانە بە ناوی (علي بن محمد الحبشي)و ئەم پیاوەش لە وەصفیدا دەڵێت: (الإمام العارف بالله الحبيب علي بن محمد الحبشي رضي الله عنه)!!! كە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| يا ملاذ الكل يا اهل الندى | يا كريم الأصل يا رب الحور |
| يا غياث الخلق يا ذا الفضل | واجود والإحسان في بحر وبر |
| يا رسول الله غوثاً عاجلاً | يدفع البلواء عنا والضرر |
| فبحق الطهر طهِّر سيدي | بجميع الأرض من هذا الضرر |
| وبحق الحسنين ارفع لما | قد عرى وارحم فقد زاد الحذر[1] |

لەمەوە بۆمان دەركەوت كە ئەم پیاوە تەوەسول دەكات بە ئال و بەیت و منداڵەكانی و بە حسن و حسین ڕەزای خوایان لێ بێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە پێغەمبەریش ﷺ لای ئەو پەرستراوی گەورەو ڕاستەقینەیە!!! پاكو بێگەردی بۆ خوای باڵا دەست و تاكو تەنها لەوەی كە موشریك و گومڕاكان دەیڵێن، ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾[2]، واتە: (خوای گەورە هیچ منداڵی بۆ خۆی بڕیار نەداوەو نیەتی، وە

(١) شفاء الفؤاد (ص٢٣٠-٢٣١).

(٢) سورة المؤمنون: (٩١).

هیچ پەرستراێکی تریشی لەگەڵدا نیەو تاك و تەنهایە، وە ئەگەر خوایەکی تری لەگەڵدا بوایەو شەریکی هەبوایە ئەوا هەریەکەیان دەستی دەگرت بەسەر دروست کراوەکانی خۆیداو ئەم گەردونە ئاوا بەڕێوە نەدەچوو، وە پاکوبێگەردی بۆ خوای گەورە لەوەی کە موشریکەکان وەصفی دەکەن).

**یەکەم: مانای وەسیلە لە زمانی عەرەبیدا:**

لە کتێبی (لسان العرب)دا هاتووە کە (الوسیلة) بە مانای: (پلەو پایەیەك دێت لە لای پاشا، وە یان پلەو دەرەجە، وە یان نزیکی، وەك: فلان کەس نزیك بۆوە لە خوای گەورە بە وەسیلەیەك، ئەمە ئەگەر کردەوەیەکی کرد بە هۆیەوە لێی نزیك بۆوە. وە (الواسل)یش بە مانای: ئەو کەسەی کە دەیەوێت بگات بەخواو لێی نزیك بێتەوە)[1].

**دووەم: مانای وەسیلە لە قورئانی پیرۆزدا:**

وشەی (الوسیلة) لە دوو ئایەتی قورئانی پیرۆزدا هاتووە:

یەکەم: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾[2].

**ووتەی موفەسیرو ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەی ئەم ئایەتە:**

ابن جریر ڕەحمەتی خوای لێ بێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (ئەی ئەوانەی کە وادەو پاداشت و سزاکانی خوای گەورەو پێغەمبەر ﷺ بە ڕاست دادەنێنن (ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ)، وە وەڵامی خوای گەورە بدەنەوە لەوەی کە ئەمرو فەرمانتان پێ دەکات و دوور بکەونەوە لەو شتانەی کە نەهیتان لێ دەکات، وە ئیمان و بڕواتان دابمەزرێنن و جێگیری بکەن بە خواو پێغەمبەرەکەی بە کردەوەی چاك، وە (وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ) واتە: داوای نزیك بوونەوە بکەن لە خوای گەورە بەو کردەوانەی کە پێی ڕازیە).

پاشان هەر ابن جریر لە ئەبو وائیلەوەو لە مانای ئەم برگەیە (وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ) دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: (بە واتای نزیك بونەوە بە هۆی کردەوەکانەوە، وە هەمان

(١) لسان العرب (١١/٧٢٤) وسل.

(٢) سورة المائدة: (٣٥).

شێوە لە عطاء و السدي و مجاهد و الحسن دەهێنێت. وە قەتادە دەڵێت: واتە لە خوای گەورە نزیك ببنەوە بـە هـۆی گوێڕایـەڵی کـردن و عیبـادەت کردنـەوە، وە بـەهۆی ئـەو کردەوانەی کە پێی ڕازیە)[1].

وە هـەروەها (البغـوي) ڕەحمـەتی خـوای لـێ بێـت دەڵێـت: (الوسـیلة: واتـە: نزیـك بونەوە)[2].

وە هەروەها ابن کثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (خوای گەورە فـەرمان دەکـات بە بەندە ئیماندارەکانی کە لە خوا بترسن، وە هەروەها کە دەفەرموێت: (وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ) دەڵێـت: سـوفیانی ثـەوری دەڵێـت: بـاوکم بـۆی گێڕاینـەوە ئـەویش لـە (طلحة)ەوە ئەویش لە (عطاء)ەوە ئەویش لە (ابن عباس)ەوە: بە واتای: نزیك بونـەوە، وە هەروەها مجاهدو ئەبو وائیل و الحسن و قەتادەو عبدالله بن کثیرو السدي و ابـن زیـد بە هەمان شێوەیان وتوە)[3].

وە هەروەها زۆربـەی زانـاو موفەسـیرانی تـریش وەك: (القـرطبي و ابـن الجـوزي و أبـو حیـان)و زۆرێکـی تـریش بـە هـەمان شـێوە تەفـسیری (الوسـیلة)یـان کـردووەو وایـان لێکداوەتەوە، بـەڵام لەبـەر درێـژ بوونـەوەی بابەتەکـە نـەمان ویـست تەفـسیری هـەموو زاناکان وەربگرین و باسیان بکەین.

وە ئەم زانایانەش کە دەفەرمون (الوسیلة) بە مانای نزیك بوونەوە (القربـة) دێت، ئـەوا هەموویان کۆکن لەسەر ئەوەی کە مانای (القربة) ئەوەیە کەوا بریتیە لە: نزیك بوونـەوە لە خوای گەورە بە عیبادەت کردن و طاعەت و گوێڕایەڵی کردنی خوای گـەورە، چـونکە مرۆڤ لە خوا نزیـك نابێتـەوە تـەنها بـە عیبـادەت کـردن و طـاعـەت و کـردەوەی چـاك نەبێت.

---

(١) تفسیر ابن جریر (١٠/٢٨٩-٢٩١).

(٢) معالم التنزیل (٢/٣٤).

(٣) تفسیر القرآن العظیم (٣/٩٦-٩٨) باختصار.

**دووەم:** وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ﴾[1]، واتـــــــه: (ئەوانەی کە ئەو بێ باوەڕو موشریکانە هاواریـان دەکـەنێ و داوای خێـرو چـاکەو نزیـك بونەوەیان لێ دەکەن لە خوای گەورە، ئایا کامیان لەوانە زیاتر پێویستیان بە ڕەحـم و بەزەیی خوای گەورە هەیەو زیاتر لـە عەزابەکـەی دەترسـن؟ بەڕاسـتی سـزاو عـەزابی خوای گەورە زۆر بە ئێش و مەترسیدارە).

**هۆی هاتنەوە خوارەوەی ئایەتەکە:**

بوخاری[2] و موسلیم[3] ڕیوایەتیان کردووە لە ڕێگەی (أبـو معمـر) ئـەویش لـە (عبـداللهی کوڕی مسعود)ەوە ڕەزای خوایان لێ بێت کە وتویـەتی: (کۆمـەڵێك مرۆڤــ پـەرستنیان بۆ کۆمەڵێك جنۆکە ئەنجام دەدا، پاشـان ئـەم کۆمەڵـە جنۆکـە موسـڵمان بـوون، بـەڵام مرۆڤەکان بەردەوام بوون لە عیبادەت کردن بۆیـان، ئنجـا خـوای گـەورە ئـەم ئایەتـەی دابەزاند.

وە موسلیم لە ڕێگایەکی ترەوە هێناویـەتی کـە: (جنۆکـەکان موسـڵمان بـوون، وە ئـەم مرۆڤانەش کە پەرستنیان بۆ دەکردن هەستیان بەوە نەکردبوو).

ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێـت لـە (فـتح البـاري)دا دەڵێـت: (مرۆڤـەکان بـەردەوام بوون لەسەر پەرستن و عیبادەت کردن بۆ جنۆکـەکان، بـەڵام جنۆکـەکان ڕازی نـەبوون بەمە" چونکە موسڵمان ببوون)[4].

(١) سورة الإسراء: (٥٧).

(٢)صحيح: البخاري (٣٩٧/٨).

(٣) صحيح: مسلم (٢٣٢١/٤).

(٤) فتح الباري (٣٩٧/٨).

**ووتەی موفەسیرو ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەی ئەم ئایەتە:**

ابن جرير ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (خوای پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی ﷺدەڵێت: ئەی محمد بە موشریکەکانی قەومەکەت بڵێ کە پەرستن وعیبادەت بۆ غەیری خوای گەورە ئەنجام دەدەن: ئەی قەوم لە کاتی دابەزینی بەڵاو ناڕەحەتی بەسەرتاندا بپاڕێنەوەو هاوار بکەنە ئەوانەی کە پێتان وایە پەروەردگارو پەرستراوتانن، ئنجا سەیر بکەن و بزانن توانایان هەیە کە ئەو بەڵاو ناڕەحەتیەی کە توشتان بووە لەسەرتان لاببەن یان لێتان لادەن؟ کە بەڕاستی گومانی تیادا نیە کە ئەوان ئەمەیان پێ ناکرێت و ناتوانن، بەڵکو ئەمە تەنها لە تواناو دەسەڵاتی دروستکاری ئێوەو ئەواندایە کە خوای گەورەو باڵا دەستە)[1].

وە (البغوي) لە مانای (الوسيلة)دا دەڵێت: (بە مانای نزیك بوونەوە دێت، وە وتراویشە بە مانای پلە (الدرجة) دێت، واتە: داوای پلە بەرزەکان دەکەن لە خوای گەورە، وە وتراوە: (الوسيلة) هەموو شتێکە کە پێی لە خوای گەورە نزیك دەبێتەوە)[2].

وە هەروەها (القرطبي) دەڵێت: (يبتغون: واتە: داوای نزیك بوونەوە دەکەن لە خوای گەورە، وە هەروەها دەپاڕێنەوەو داوای بەهەشت دەکەن)[3].

وە پوختەی ڕاڤەکارانی قورئان دەربارەی مانای (الوسيلة) ئەوەیە کە: بە مانای نزیك بوونەوەو عیبادەت و طاعەت و کردەوەی چاك دێت، واتە بەم شتانە مرۆڤ دەتوانێت لە خوای گەورە نزیك ببێتەوەو داوای ڕەزامەندی و لێ خۆش بوونی لێ بکات، نەك بەم شێوەیەی کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی گومان دەبەن و لێکی دەدەنەوە، چونکە یەکێك نەتوانێت خراپەو بەڵاو ناڕەحەتی لەسەر خۆی لاببات، چۆن دەتوانێت لەسەر خەڵکانی تری لاببات؟!!

---

(١) تفسير ابن جرير (٩/١٠٣).

(٢) معالم التنزيل (٣/١٢٠).

(٣) تفسير القرطبي (١٠/٢٧٩).

**سێیەم: مانای وەسیلە لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ:**

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من قال حين يسمع النداء: اللهم رب هذه الدعوة التامة والصلاة القائمة آت محمداً الوسيلة والفضيلة، وابعثه مقاماً محموداً الذي وعدته، حلت له شفاعتي يوم القيامة)[1] ، واتە: (هەر کەسێك کە گوێی لە بانگ بوو دوای بانگەکە بڵێت: ئەی پەروەردگاری ئەم بانگە تەواوو ئەو نوێژەی کە ئەنجام دەدرێت، (وەسیلەو فەضیلە) ببەخشە بە محمد ﷺ، وە بیگەیەنە ئەو پلە بەرزو سوپاس کراوەی کە بەڵێنت پێداوە. ئەوا لە قیامەتدا شەفاعەتی منی بۆ دەبێت).

**دووەم:** لە عبداللّٰهی کوڕی عەمری کوڕی عاص)ەوە کە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرمویەتی: (إذا سمعتم المؤذن فقولوا مثل ما يقول ثم صلوا عليَّ، فإنه من صلى عليَّ صلاة صلى الله عليه بها عشراً، ثم سلوا لي الوسيلة فإنها منزلة في الجنة لا تنبغي إلاّ لعبد من عباد الله وأرجو أن أكون أنا هو، فمن سأل لي الوسيلة حلت له الشفاعة)[2] ، واتە: (ئەگەر گوێتان لە بانگ بوو ئەوا وەك ئەو بیڵێنەوەو پاشان صەڵاوات لەسەر من بدەن، چونکە هەر کەسێك یەك صەڵاوات لەسەر من لێ بدات، ئەوا خوای گەورە دە جار صەڵاواتی لەسەر دەدات، دواتر داوا لە خوای گەورە بکەن کە (وەسیلە)م پێ ببەخشێت کە ئەویش شوێنێکە لە بەهەشت، ئەو شوێنەش بۆ هیچ کەسێك نیە تەنها بۆ بەندەیەك نەبێت لە بەندەکانی خوای گەورە، وە ئومێد دەکەم کە ئەو کەسە من بم، وە هەر کەسێك داوای وەسیلەم بۆ بکات ئەوا شەفاعەتی منی بۆ حەڵاڵ دەبێت).

وە پێشەوا ابن حجر لە (فتح الباري)دا دەڵێت: (وەسیلە: بریتیە لەو شتەی کە بە هۆیەوە نزیك دەبیتەوە بۆ لای کەسێکی گەورەتر، وە وتراوە: (توسلت)؛ واتە: نزیك بومەوە. وە ئەمەش زیاتر بۆ پلەو پایەی بەرز بەکار دەهێنرێت).

وە هەروەها دەڵێت: (وە (الفضيلة) بە واتای: پلەو پایەیەکی زیاتر بەسەر هەموو خەڵکیەوە، وە دەگونجێت پلەیەکی بەرزتر بێت، یان تەفسیرو لێکدانەوە بێت بۆ (وەسیلە)[3].

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٢/٩٤).

(٢)صحيح: رواه مسلم (٣٨٤).

(٣) فتح الباري (٢/٤٩٥).

**یەكەم: تەوەسولی شەرعی (ڕێگە پێدراو).**

تەوەسولی شەرعی بریتیە لە نزیك بوونەوە لە خوای پەروەردگار بەهەر شتێك كە پێی خۆشەو لێی ڕازیە لە ووتەو كرداری دیارو نادیار، وە هەروەها هەموو ئەو عیبادەت و خوا پەرستیانەی كە بەڵگەی شەرعیان لەسەرە.

وە دەشتوانرێت تەوەسول كردن بۆ دوو شێوەو مەبەست ئەنجام بدرێت:

**أ. تەوەسول كردن بۆ بەدەست هێنانی پاداشتی خوای گەورەو بەهەشت و خۆشویستن و ڕەزامەندی خوای پەروەردگار**، وە بەڵگەی شەرعی زۆر هاتووە كە ئیمان و كردەوەی چاك دوو وەسیلەی گرنگن بۆ گەیشتن بە بەختەوەری لە دونیاو دوارۆژدا.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴾[1]، واتـە: (ئەوانـەی كـە ئیمـانی تـەواویان هێنـاوە لـە دڵەكانیانداو بە لاشەش كردەوەی چاك ئەنجام دەدەن، وەئەوانەی خاوەنی ئەم ئیمانـە تەواوە بن ئەوا خوای گەورە بەرزترین و باشترین شوێنی بەهەشـتی بـۆ دانـاون، وە بـە بەردەوامی تیایـدا دەمێننـەوەو لەبەر خۆشـی شـوێنەكە هـەرگیز حـەز ناكـەن لـەوێوە بگوازرێنەوە بۆ شوێنێكی تر).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾[2]،واتـە: (هـەر كەسـێك كردەوەی چاك ئەنجام بدات جا ئەو كەسە نێر بێت یان مێ، ئەوە لـە ژیـانێكی خۆشـدا دەیژێنین و دەیخەینـە نـاو ئاسـودەیی و بەختەوەریـەوە، وە لـە قیامەتیـشدا پاداشـتی دەدەینەوە زۆر زیاترو چاكترو باشتر لەوەی كە لە دونیادا ئەنجامی داوە).

---

(١) سورة الكهف: (١٠٧- ١٠٨).

(٢) سورة النحل: (٩٧).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ﴾[١]، واتە: (خوای گـەورە بـەڵێن و پـەیمانی بەوانـە داوە کـە ئیمانیـان هێنـاوەو کردەوەی چـاك ئـەنجام دەدەن بەوەی کـە دەیانکـات بـە خـەلیفـەو جێنـشین لەسـەر زەوی هـەروەك چـۆن ئـەوەی بـە ئوممەتانی پێشوو بەخشی، وە هەروەها ئەو دینەی کە پێی ڕازیە بۆیان سـەردەخات و پەرەی پێ دەدات، وە ئەو ترس و ناڕەحەتیەی کە لە سەریان بوو بۆیان دەگۆڕێت بە ئەمن و ئاسایش، وە هـەموو ئەوانـەش بـۆ ئـەو کەسـانەیە کـە بـە تـەنها دەیپەرستن و هاوەڵی بۆ دانانێن).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِۦ وَيَجْعَل لَّكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِۦ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[٢]، واتـە: (ئـەی ئەوانەی کەوا ئیمانتان هێنـاوە بـە خـوا (کـە لێـرە مەبەست ئەوانـەن کـە ئیمانیـان بـە موسـاو عیـسا هێنـابوو سـەلامی خوایـان لـێ بێـت)، وە ئیمانتـان هێنـاوە بـە پێغەمبەرەکـەی، ئـەوا بەڕاستی خـوای گـەورە دوو ئـەجرو پاداشـتتان بـۆ دەنوسێت، یـەکێکیان لەسـەر ئـەوەی کـە شـوێن پێغەمبـەرانی پێشوو کـەوتبوون و ئیمانتـان پـێ هێنابوون، وە ئەوی تریشیان لەسـەر ئـەوەی کـەوا ئیمانتـان بـە پێغەمبـەر محمد ﷺ هێناوە، وە خوای گەورە عیلم و زانست و نورێکتـان پـێ دەبەخشێت تـا لـە تاریکایی جەهل و نەزانیدا ڕێگای ڕاستتان لێ ون نەبێت، وە لێتـان خـۆش دەبێـت کـە بەڕاستی خوای گەورە زۆر لێ خۆش بوو و بەزەییە).

---

(١) سورة النور: (٥٥).

(٢) سورة الحديد: (٢٨).

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفـەرموێت: (أشـهد أن لا إلـه إلاّ الله وأنـي رسـول الله، لا يلقى الله بهما عبد غير شاكٍ فيحجب عـن الجنـة)[1] ، واتـە: (شـاهێدی دەدەم کـە هـیچ پەرستراوێکی بە حەق نیە جگە لە الله وە منیش نێردراوی خوام).

**ب. تەوەسول کردن بەمانە بۆ گیرابوون و قەبوڵ بوونی پاڕانەوەو پێ بەخـشینی ئـەو شتەی کە داوا دەکرێت.**

وە ئـەم جـۆری تـەوەسـول کردنـەش شـەرعیە بـە بەڵگـەی قورئـان وسـوننـەت و کـۆڕای زانایان (إجماع العلماء)، واتە دروستە تەوەسول کردن بۆ لای خوای گەورە بـە ئیمـان و کردەوەی چاك بۆ وەڵام دانەوەی ئەو دوعاو پاڕانەوەیەی کە دەکرێت.

ئەمە لە کاتێکدا خودی دوعا کردن و پاڕانەوە یەکێکن لە گەورەترین وەسیلەکانی نزیك بوونەوەو گەیشتن بە خۆشەویستی و بە دەست هێنـانی بەهەشت و ڕەزامەنـدی خـوای گەورە، چونکە دوعاو پاڕانەوەش هەر لەناو طاعەت و عیبـادەت و کـردەوە چـاکەکانن، وە بگرە لە گەورەترین عیبادەت و کردەوە چاکەکانە کە هۆکارن بۆ نزیـك بوونـەوە لـە خوای گەورە، هەروەك چۆن هۆکارێکیشە بۆ بـە دەست هێنـانی ئـەو شـتانەی کـە لـە خوای گەورە داوا دەکرێن.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾[2]، واتـە: (خـوای گـەورە دەفەرموێت ئێـوە لـێم بپاڕێنـەوە منـیش وەڵامتـان دەدەمـەوە، وە بەڕاسـتی ئەوانـەی خۆیان بە گەورە دەزانن لە عیبادەت کردن بۆ من، ئەوا دەخرێنە دۆزەخەوە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەخرێنە ناویەوە).

لەم ئایەتـەدا خـوای گـەورە فـەرمان بـە بەنـدەکانی دەکـات بـە پاڕانـەوە، وە ناویـشی دەنێت بە عیبادەت، وە هەروەها بە ئاگریش هەڕەشە لـەو کەسـانەی دەکـات کـە وازی

---

(١) صحيح: رواه مسلم (ح٤٦).

(٢) سورة غافر: (٦٠).

لێ دەهێنن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خاڵی یەکەم کە تەوەسول کردن بەم شتانە دروستە بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستی و ڕەزامەندی و بەهەشت و پاداشتی خوای گەورە.

وە هەروەها خوای گەورە بەڵێنیش دەدات بە بەندەکانی کە وەڵامیان دەداتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خاڵی دووەم کە ئەویش تەوەسول کردنە بۆ وەڵام دانەوەی دوعاو پاڕانەوەکان.

وە هەروەها بەڵگەشمان لە قورئان و سوننەت زۆرە لەسەر گەورەیی و فەزڵی دوعاو پاڕانەوە، وە ئەوەش کە دروستە بەکار بهێنرێن وەك وسیلەیەك بۆ نزیك بوونەوە لە خوای گەورەو هەروەها بۆ بەدەست هێنان و دەست خستنی فەزڵ و نیعمەت و بەخششەکانی خوای گەورە، وە مەبەستیش لێرەدا ئەوەیە کە دروستە تەوەسول کردن بە ئیمان و کردەوەی چاك بۆ وەڵام دانەوەی دوعاو پاڕانەوەکان، جا یان بۆ بەدەست هێنانی سودو قازانج و خێرو خۆشیە، یا بۆ لابردنی بەڵاو موصیبەتە لە دونیاو دواڕۆژ.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[1]، واتە: (ئەوانەی کە دەیان وت: خوایە گیان ئێمە ئیمان و بڕوامان هێناوە، لە گوناهو تاوانەکانمان خۆشبەو بمانپارێزە لە ئاگری دۆزەخ).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ﴾[2]، واتە: (خوایە گیان ئێمە گوێمان لە بانگەوازکارێك بوو کە محمدە ﷺ بانگی خەڵکی دەکرد بۆ ئیمان هێنان بە پەروەردگارو ئێمەش وەڵاممان دایەوەو ئیمانمان هێنا، خوایە گیان

(١) سورة آل عمران: (١٦).

(٢) سورة آل عمران: (١٩٣).

لەبەر ئەو ئیمان هێنانەمان لە گوناهو تاوانەكانمان خۆشبەو بیان سڕەوە لەسەرمان و جێگیرمان بكە لەسەر حەق و لەگەڵ چاكەكاران بمان مرێنە).

دەبینین ئەمانە لە دوعاكانیاندا تەوەسولیان كرد بەو ئیمانەی كە هەیانە، كە ئەمەش گەورەترین هۆكارە بۆ قەبوڵ بوونی دوعاو وەڵام دانەوەیان.

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَـٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ﴾[1]، واتە: (خوای گەورە كۆمەڵێك ناوو سیفەتی جوان و بەرزی هەنە، بەو ناوو سیفەتە جوان و بەرزانە لێی بپاڕێنەوە، وە ئەوانەی لادەدەن لەو ناوە جوانانەو ماناكەیان دەگۆڕن، یان بەكاریان دەهێنن بۆ كەسانێك كە دەیان پەرستن، وەك ئەوەی كە موشریكەكان بەو ناوانە بت و پەرستراوەكانی خۆیانیان پێ ناو دەنا، ئەوا توشی سزاو عەزابێكی توندو بە ئێش دەبن).

وە لێرەشدا خوای پەروەردگار فەرمان بە بەندەكانی دەكات كە بە ناوە جوانەكانی لێی بپاڕێنەوە، كە ئەمەش هەردوو جۆری دوعای عیبادەت و دوعای مەسئەلەو داواكاری دەگرێتەوە.

وە هەروەها لە فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی دوعای دڵتەنگی و غەمباری هاتووە كە دەفەرموێت: (اسألك بكل اسم هو لك سميت به نفسك أو أنزلته في كتابك أو علمته أحداً من خلقك....)[2] ، واتە: (لێت دەپاڕێمەوەو داوات لێ دەكەم بە هەموو ئەو ناوانەی هی تۆن و خۆت پێ ناو ناون، وە ئەوانەی لە قورئانی پیرۆزدا دات بەزاندوون وە ئەوانەی كە فێری هەر دروستكراوێكی خۆت كردووە ........).

وە ئەمەش بە هەمان شێوە تەوەسول كردنە بە هەموو ناوە جوانەكانی خوای گەورە، كە ئەمانەش گەورترین شتێكن بۆ ئەوانەی كە دەپاڕێنەوە تەوەسولی پێ بكەن، وە فەرمودەش لە بارەیەوە زۆر هاتوون و بڵاون لەناو موسڵماناندا.

---

(١) سورة الأعراف: (١٨٠).

(٢) صحيح: رواه أحمد (٣٩١/١)، وصححه إمامنا الألباني (رحمه الله) في (السلسلة الصحيحة) (١٩٩).

وە هەروەها (بريدة الأسلمي) ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو دەپاڕایەوەو دەی وت: (اللهم إني أسألك بأني أشهد أنك أنت الله الذي لا إله إلاّ أنت الأحد الصمد الذي لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفواً أحد). پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە بەڕاستی ئەو کەسە بە ناوە گەورەکەی خوای گەورە داوای کرد، ئەو ناوەی کە ئەگەر پێی پاڕایتەوە وەڵامت دەدرێتەوە، وە ئەگەر پێت داوا کرد ئەوا پێت دەبەخشرێت)[1].

وە هەروەها ئەم تەوەسول کردنە بە ئیمان و کردەوەی چاك بۆ وەڵام دانەوەی دوعاو پاڕانەوەکان، شەریعەتی پێغەمبەرانی تریش سەلامی خوایان لێ بێت لەگەڵیدا هاوڕاو کۆکن، هەروەك پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەواڵی پێداوین، لەوانەش:

❁ لە ئەبو هریرەوە ڕەزای خوای لێ بێت کە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی بەسەرهاتی ابراهیم سەلامی خوای لێ بێت لەگەڵ خێزانەکەی فەرمویەتی: (کاتێك ابراهیم سەلامی خوای لێ بێت لەگەڵ خێزانەکەی (سارە)خاتوون دەچن بۆ گوندێك ئەو گوندەش پاشایەکی ستەمکاری لێیە، کاتێك باسی جوانی سارە خاتوونی پێ دەگات داوا دەکات و دەیەوێت بچێت بۆلای و کاری خراپی لەگەڵ بکات، کاتێك پاشا ستەمکارەکە دەیەوێت دەستی بۆ ببات ئەویش هەڵدەستا دەست نوێژی دەگرت و نوێژی دەکردو ئەو دوعاو پاڕانەوەیەی دەوت: (اللهم إن كنت آمنت بك وبرسولك وأحصنت فرجي إلاّ على زوجي فلا تسلط عليَّ الكافر)، خوای گەورەش پاراستی لێی، پاشان بۆ جاری دووەم هەوڵی دایەوە ئەویش هەمان کاری جاری یەکەمی دووبارە کردەوە، دەست نوێژی گرت و نوێژی کردو پاڕایەوە، خوای گەورەش لە دەستی ئەو زاڵم و ستەمکارە ڕزگاری کرد)[2].

---

(١) صحيح: رواه أبو داود (١٦٧/٢)، والترمذي (٤٨١/)، وصححه إمامنا الألباني (رحمه الله) في (مشكاة المصابيح) (٢٢٨٩).

(٢) صحيح: رواه البخاري (٢٢١٧)، واللفظ له، ومسلم (٢٣٧١).

تێگەیشتین کە ئەم ئافرەتە بەڕێزە لە دوعاکانیدا تەوەسولی کرد بەو ئیمانەی کە بە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی و بەو داوێن پاکیەی کە هەیبووە، وە هەروەها بەو کردەوە چاکانەش کە بە کردەوە ئەنجامی دان وەك دەست نوێژ گرتن و نوێژ کردن و پاڕانەوەکەی، وە بە دڵنیاییشەوە ئەمە لەو شەریعەتەوە فێری بووە کە بۆ پیاوەکەی هاتووەو لەسەری بووە.

❁ وە هەروەها چیرۆکی (جريجي ڕاهب)، کاتێك ئافرەتێکی خراپ و داوێن پیس ویستی بوهتانی پێ بکات بەوەی کە ئەو منداڵەی لە شوانێك ببوی ویستی بیخاتە ئەستۆی ئەو، پاشان (جريج) دەست نوێژی گرت و نوێژی کردو لەبەر خوای پەروەردگار پاڕایەوە، پاشان بە منداڵەکەی وت کێ باوکتە؟ لە کاتێکدا منداڵەکە لە بێشکەدا بوو، ئەویش وتی: شوانەکە)[1].

❁ وە هەروەها چیرۆکی ئەو سێ کەسەی کە چونە ئەشکەوتەکەوەو پاشان بەردێکی گەورە دەرگای ئەشکەوتەکەی لێ گرتن و دەرگای لێ داخستن، ئنجا بە یەکتریان ووت: بپاڕێنەوە بە چاکترین کردەوە کە ئەنجامتان داوە، یەکێکیان وتی: خوایە گیان من دایك و باوکێکی پیرو بەساڵا چووم هەبوون... ئنجا باسی چاکەی خۆی دەکات لەگەڵیانداو پاشان دەڵێت: (اللهم إن كنت تعلم أني فعلت ذلك ابتغاء وجهك فافرج عنا فرجة نرى منها السماء)، دەفەرموێت: کەلێنێکیان بۆ کرایەوەو کەمێکی دەرگاکە بۆوە، وە دووەمیشیان تەوەسولی بە داوێن پاکی خۆی کرد کە لە ترسی خوای گەورە داوێن پیسی نەکردووە لە کاتێکدا بۆیشی ئاسان بووە، وە سێیەمیشیان تەوەسولی کرد بە گەیاندنەوەو گێڕانەوەی ئەمانەت وسپاردەو چاکە کردنی لەگەڵ کرێکارەکانیدا، پاشان دەرگاکەیان بە تەواوی بەسەردا کرایەوە[2].

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٣٤٣٦)، ومسلم (٢٥٥٠).

(٢) صحيح: متفق عليه. اللؤلؤ والمرجان (٣/٢٣٦).

وە هەروەها دروستە تەوەسول كردن بەو ئیمانەی كە كەسێك بە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی و بەو خۆشویستن و گوێڕایەڵی كردنەی كە بۆی هەیە:

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[1]، واتە: (وە ڕەحمەت و بەزەیی من زۆر فراوانەو هەموو شتێك دەگرێتەوە، وە ئەو ڕەحمەت و بەزەییەش دەبەخشم بەوانەی كە تەقوای خوا دەكەن و زەكاتی ماڵەكانیان دەدەن و باوەڕیشیان بە ئایەت و فەرمانەكانمان هەیە، ئەوانەی كەوا شوێن ئەو پێغەمبەرە كەوتن كە نەیدەزانی بنوسێت و بخوێنێتەوە، وە لە لای ئەوانیش لە تەورات و ئینجیلدا باسی ئەو پێغەمبەرە كراوە، وە فەرمانیان پێ دەكات بە كاری چاكەو ڕێگرییان دەكات لە ئەنجامدانی كاری چەوت و خراپ، وە چی پاكو خاوێنە بۆی حەڵاڵ كردوون و چی پیس و بێزراویشە لەسەری حەرام كردوون، بۆیە ئەوانەی كە ئیمانی پێ دەهێنن و بەگەورەی دەزانن و سەری دەخەن و شوێن ئەو قورئانە دەكەون كە بۆی دابەزاندووە، بەڕاستی ئائەوانە سەرفرازو سەربەرز دەبن).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿قُلْ إِنْ كُنْتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ﴾[2]، واتە: (ئەی محمد بڵێ: كە بەڕاستی ئێوە خواتان خۆش دەوێت، ئەوا

---

(١) سورة الأعراف: (١٥٦ – ١٥٧).

(٢) سورة آل عمران: (٣١).

شوێنی من بکەون خوای گەورەش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو تاوانەکانتان خۆش دەبێت).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴾[١]، واتە: (ئەوانەی کە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر دەکەن و لە خوای گەورەش دەترسن و تەقوای ئەو دەکەن، ئەوا بەڕاستی ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن).

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان، أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلاّ لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد أن أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار)[٢] ، واتە: (سێ سیفەت هەن هەر کەسێك تیایدا بن ئەوا لەزەت و شیرینی ئیمان دەچێژێت، خواو پێغەمبەری ﷺ لە هەموو شتێك لا خۆشەویستتر بێت، وە کە کەسێکیشی خۆش ویست ئەوا تەنها لەبەر خوا خۆشی بوێت، وە هەروەها پێی ناخۆش بێت کە بگەڕێتەوە سەر کوفرو بێ باوەڕی دوای ئەوەی کە خوای گەورە ڕزگاری کرد لێی هەروەك چۆن پێی ناخۆشە کە بخرێتە ناو ئاگرەوە).

وە هەر لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: (لايؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده و ولده والناس أجمعين)[٣] ، واتە: (ئیمانی هیچ یەکێکتان تەواو نابێت تا ئەو کاتەی منی خۆشتر نەوێت لە دایك وباوك و منداڵ و هەموو خەڵکی).

کەواتە لێ خۆشبوون و تەواو بوونی ئیمان و کەوتنە بەر ڕەحمەتی خوای گەورە بەندە بە شوێن کەوتن و دەست گرتن بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ، نەك بەم شێوەیەی کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی ئەنجامی دەدەن، کە بریتیە لەوەی کەوا پێغەمبەر ﷺ

---

(١) سورة النور: (٥٢).

(٢) صحيح: رواه البخاري (١/٦٠)، ومسلم (٤٣).

(٣) صحيح: رواه البخاري (١/٥٨)، ومسلم (٤٤).

دەکەن بە هاوبەش و شەریك لەگەڵ خـوای گـەورەداو لادانـی زۆر جـۆری عیبـادەت لـە خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ.

لێرەوە دەتوانین تەوەسولی شەرعی بکەین بەچەند بەشێکەوە، ئەوانیش[1]:

أ. تەوەسول کردن بەو ئیمانەی کە ئیماندار هێناویەتی.

ب. تەوەسول کردن بە تەوحیدو تەنها پەرستنی خوای گەورە.

ت. تەوەسول کردن بە ناوو سیفەتە جوانەکانی خوای گەورە.

پ. تەوەسول کردن بە کردەوەی چاك.

ج. تەوەسـول کـردن بـە وازهێنـان لـە گونـاهو تـاوان وەك وازهێنـان لـە عـەرەق خواردنەوەو زیناو...هتد.

ح. تەوەسول کـردن بـە دوعـای خێری پێغەمبـەران و پیـاو چـاکان بـەڵام تـا ئـەو کاتەی کە لە ژیاندان.

**دووەم: تەوەسولی ناشەرعی (ڕێگە پێ نەدراو):**

هەروەك پێشتر باسمان کـرد کـە (وەسـیلە) بریتیـە لـە نزیك بوونـەوەو طـاعـەت و عیبـادەت، وە هـەروەها پەیوەستیـشە بـە دڵـسۆزی و نیـەت پـاکی لـەو عیبـادەت و کردەوانەی کە دەکرێن بەوەی کە تەنها بۆ خوای گەورە بێـت و هـاوەڵی بـۆ دانـەنرێت، وە شوێن کەوتنیش بێت بۆ پێغەمبەر ﷺ لە هەموو ئەمرو نەهی و کردارەکانیدا.

ئا ئەمە ئەو (وەسیلە)یەیە کە خـوای گـەورە فـەرمانی پێکـردووەو کردویـەتی بـە شەریعەت بۆ بەندەکانی لەسەر زمانی پێغەمبەران سەلامی خوایان لـێ بێـت، هـەروەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ﴾[2]، واتـە:

(١) بە کورت کراوەیی و کەمێك دەستکاریەوە وەرگیراوە لە (منهاج الفرقة الناجية والطائفة المنصورة)، نوسینی شیخ محمد بن جميل زينو.

(٢) سورة الشورى: (١٣).

(خوای گەورە بۆی بە شەرع و دین داناون هەر ئەوەی كە بۆ نوحی نـاردووەو فـەرمانی پێكردووە، وە ئـەو دینـەی كـە بـۆ تۆمـان نـاردووە هـەر ئەوەیـە كـە ابـراهیم و موسـاو عیسای پیێ ئامۆژگاری كراوەو داوایان لیێ كراوە، ئەویش ئەوەیـە كـە دەسـت بگـرن بـە هەموو دینەكـەوەو فەرمانـەكانی جـیێ بـەجیێ بكـەن و دوور بكەونـەوە لـە نەهیـەكانی و ناكۆك و جیاواز نەبن تیایدا).

كەواتە هەر شتێك خوای گەورە بە شەرعی دانابێت ئەوە وەسیلەیە بـۆ نزیـك بوونـەوەو گەیشتن بە مەبەست، وە هەر شتێكیش خوای گەورە ڕێگەی پیێ نەدابێت ئـەوا دروسـت نیە بكرێت بە وەسیلەو هۆكارێك بـۆ نزیـك بوونـەوە لـە خـوای پـەروەردگار، وە ئەگـەر گومانیش ببرێت كە ئەمە وەسیلەو هۆكارێكە بۆ نزیك بوونەوە لە پەروەردگار، ئـەوا بـە دڵنیابیەوە گومان هیچ ئیعتبارو بنچینەیەكی نیەو ﴿ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴾.

لێرەوە هـەر كەسـێك بـە شـێوازێك عیبـادەت بكـات و خـوای گـەورەش بـە عیبـادەتی دانەنابێت و فەرمانی ئەوی لەسەر نەبێت، ئەوا بەڕاسـتی هەڵەیـەكی گـەورەی كـردووەو ڕێگا ڕاستەكەی لیێ وون بووەو تووڕە بوون و سزای خوای گەورە چاوەڕێیەتی.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴾[1]، واتـە: (بەڕاسـتی هـەر ئـەوە ڕێگـای ڕاستی منـەو شـوێنی بكـەون، وە شـوێن ڕێـچكەو كـوێرە ڕێگاكـان مەكەون، چونكە ئەم ڕێچكانە لە ڕێگا ڕاستەكە لاتان دەدن، وە هەر بەوەش ئامۆژگاری كراون بەڵكو لەو كەسانە بن كە تەقوای خوا دەكەن و لە خوا دەترسن).

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴾[2]، واتـە: (هـەر كەسـێك

---

(١) سورة الأنعام: (١٥٣).

(٢) سورة النساء: (١١٥).

پێـچەوانەو دژایـەتی پێغەمبـەر ﷺ بكـات لـەوەی كـە هێناویـەتی دوای ئـەوەی كـە ڕێنومایی و هیدایـەتی بـۆ ڕوون كرایـەوەو شـوێن ئـەو ڕێبـازە نەكـەوت كـە ئیمانـدارانی لەسەرن، ئەوا وازی لێ دەهێـنین بـۆ ئـەو شـتەی كـە خـۆی دوای كـەوتووەو پاشـانیش دەیخەینە دۆزەخەوە، كە ئەوەش خراپترین جێگاو شوێنە).

بەڕاسـتی هـەر ڕێگـای ڕاسـت ڕێگـای خـوای گەورەیـەو هـەر ئـەویش ڕێگـای ڕاسـتی ئیماندارانە، وە هـەر ئـەوەیش ئـەو وەسیلەیەیە كـە خـوای گـەورە ڕەزامەنـدی لەسـەر دەربڕیوەو بە شەریعەتی دانـاوە بـۆ بەنـدەكانی، وە غـەیری ئـەو ڕێگـا ڕاسـتە ڕێـچكەو كوێرە ڕێگای سەر لێ شێواوو گومڕاكانە.

وە بەڵگـەش لەسـەر حـەرام بـوون و ڕێگـە پـێ نـەدانی تەوەسـول كـردن بـە بیدعـەو عیبادەت و كردەوەی داهێنراو زۆرن، لەوانەش:

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾[1]،

واتـە: (ئایا ئەو هاوبەش دانەرانـە هـیچ هـاوەڵ و هاوبەشـێكیان هەیـە كـە ئـەو شـیرك و بیدعەیەیان هێناوەتە ئاراوەو خوای گەورەش ئیزنی پێ نەداون؟ وە ئەگەر ئـەو بەڵێنـە نەبوایە كە خوای گەورە داویـەتی بـەوەی كـە سزایان دوا بخـات ئـەوا هـەر لـە دونیـادا خـوای گـەورە سـزای دەدان، وە بەڕاسـتی عـەزاب و سـزایەكی زۆر تونـدو بـە ئـازار چاوەڕێی زاڵم و ستەم كارەكان دەكات).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ ثُمَّ قَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيۡنَا بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ﴾[2]، واتـە: (پاشـان بـە

---

(١) سورة الشورى: (٢١).

(٢) سورة الحديد: (٢٧).

دوای ئەو پێغەمبەرانەدا چەندان پێغەمبەری ترمان ناردووە وەك عیسای کوڕی مەریەم کە ئینجیلمان بۆ ناردووە وە ڕەحمەت و بەزەییمان خستە ناو دڵی شوێن کەوتوانیەوە، وە کۆمەڵێك لە شوێن کەوتوانی وازیان لەناو خەڵکی هێناو لێیان دوور کەوتنەوە، وە ئێمە ئەوەمان لەسەر پێویست نەکردبوون بەڵکو خۆیان دایانهێنابوو بە مەبەستی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای گەورە، بەڵام کەمێکیان نەبن بە چاکی ئەنجامیان نەدا).

وە هەروەها پێغەمبەریش ﷺ لە کاتی وتارو ئامۆژگاریەکانی دەیفەرموو: (أما بعد: فإن خير الحديث كتاب الله، وخير الهدي هدي محمد، وشر الأمور محدثاتها، وكل بدعة ضلالة)[١] ، واتە: (پاش ئەمە: بەڕاستی باشترین وتە کتێبی خوای گەورەیە، وە باشترین هیدایەت و ڕێنومایی هیدایەت و ڕێنومایی محمدە ﷺ، وە خراپترین کار شتی تازە داهێنراوە[٢]، وە هەموو داهێنراوێکیش گومڕاییە).

وە هەروەها فەرمویەتی: (وإياكم ومحدثات الأمور، فإن كل بدعة ضلالة)[٣] ، واتە: (وریابن لە هەموو ئەو شتانەی کە تازەو داهێنراون، چونکە بەڕاستی هەموو داهێنراوێك گومڕاییە).

وە هەروەها فەرمویەتی: (من أحدث في امرنا هذا ما ليس منه فهو رد)، وفي لفظ مسلم: (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو رد)[٤] ، واتە: (هەر کەسێك شتێك لەو دینەی

---

(١) صحيح: رواه مسلم (٨٦٧).

(٢) مەبەست لە شتی تازە داهێنراو هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە کە بە ناوی عیبادەتەوە دەکرێن و خراونەتە ناو دینەوە، بەڵام لە بنچینەشدا کەمو زۆر هیچ پەیوەندیەکیان بە دینەوە نیەو لە دیندا نین. وە هەموو ئەو شتە داهێنراوانەی تر کە پەیوەندیان بە ژیانی دونیاو کاروباری بەڕێوەبردنەوە هەیە ناگرێتەوە، وەك: ڕێنوماییەکانی هاتوچۆو پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو دروست کردنی کۆمپیوتەرو هۆکارەکانی گەیاندن....هتد.

(٣) صحيح: رواه أبو داود (٤٦٠٧)، والترمذي (٢٦٧٨)، وصححه إمامنا الألباني (رحمه الله) في (صحيح الترغيب والترهيب) (٣٧).

(٤) صحيح: رواه البخاري (٥/٣٠١)، ومسلم (١٧١٨).

ئێمەدا دابهێنێت و تیایدا نەبێت، ئەوا ڕەت دەکرێتەوە)، وە لە ڕیوایەتی (مسلم) دا (هەر کەسێك کردەوەیەك بکات و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت، ئەوا ڕەت دەکرێتەوە).

ئیمامی نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (الرد: لێرەدا بە مانای ڕەت دەکرێتەوە، یان بە مانای: ئەوە باطل و بێ بنەمایەو پشتی پێ نابەسترێت، وە ئەم فەرمودەیە بنچینەیەکی گەورەیە لە بنچینەکانی ئیسلام و لە ووتە کۆکراوەو پڕ ماناکانی پێغەمبەرە ﷺ، وە بەڕاستی بەو پەڕی ڕاشکاوانە هەموو بیدعەو داهێنراوێك ڕەت دەکاتەوە)[1].

وە هەروەها ئیمامی ابن حجر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت: (ئەم فەرمودەیە بەبنچینەیەکی گرنگ دەژمێردرێت لە بنچینەکانی ئیسلام)، تا دەڵێت: (وە هەموو داهێنراوێك ڕەت دەکاتەوەو نەهیش لە فەساد دەکات، چونکە شتی نەهی لێکراو هیچیان فەرمانی دینیان لەسەر نیە)[2].

وە بەڵگەش لەسەر دوورکەوتنەوە لە بیدعەو شتی داهێنراو لە قورئان و سوننەت و کۆڕای زانایان و پێشەوایان زۆرن و زیاترن لەوەی کە بژمێردرێن، وە بە ووردبونەوەش لە هەموو ئەو بەڵگانەی کە ووریایی دەدەن دەربارەی بیدعە، دوو خاڵی زۆر گرنگمان بۆ ڕوون دەبێتەوە:

**یەکەم:** بەتاڵی تەوەسولی داهێنراوو ناشەرعی و خراپیەکەی، وە ئەوەش کە ڕەت دەکرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، وە لەسەریشی توشی حەسرەت و پەشیمانی و ڕەنج خەساری دەبێت، وە خوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾[3]، واتە: (وە کردەوەی چاکی بێ باوەڕەکان دەکەین بە تەپ و تۆزوو غوبارێکی بە هەدەر ڕۆیشتوو وە لە دوا ڕۆژدا هیچ سودێکی لێ نابینن).

---

(١) شرح مسلم (١٢/١٦).

(٢) الفتح (٥/٣٠٣).

(٣) سورة الفرقان: (٢٣).

**دووەم:** وە ئـەو كەسـەش كـە تەوەسـول بـە شـتی داهێنـراوو ناشـەرعی دەكـات هەڕەشەی لێ كراوە بە سزادان لـە دواڕۆژدا، وە لەگـەڵ ئـەو دڵ ڕەشـی و دڵ توندی و ناڕەحەتیەی كە لە دونیادا توشی دەبێت، وە هەر ئەمەش بەس نیـە كـە كردەوەكـانی ڕەت بكرێنەوەو پاداشـتی لەسـەر دەسـت نەكـەوێت و ماندوبونەكـەی بـە فـیڕۆ بـچێت، بەڵكو تورەیی و سزای خوای گەورە لەسەری زیاد دەكات و بەردەوام دەبێت لەسەری.

خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾[1]، واتە: (ئەی محمد بەخەڵكی بڵێ: ئایا هـەواڵتان بـدەمێ دەربـارەی ئەوانـەی كـە لـە هـەموو خـەڵكی زیـاتر زەرەرمەنـدن؟ ئەوانـەن كـە كردەوەیان كردووە لە ژیانی دونیایاندا بەڵام هەمووی بەتاڵەو لێیان قەبوڵ نـەبووە، وە واشیان زانیوە كە ئەوان كارو كردەوەی زۆر چاكیان ئەنجام داوە).

وە دەتـوانین تـەوەسـولی ناشـەرعی و ڕێگـە پـێ نـەدراویش دابـەش بكـەین بـە چـەند بەشێكەوە، ئەوانیش[2] :

أ. تەوەسول كردن بە مردوان و داوای كۆمەكی كردن و پێداویستیەكان لێیان، وەك لە ڕوژگاری ئەمڕۆدا بە چاوی خۆمان زۆری لێ دەبینین.

ب. تەوەسول كردن بـە جـاهو پایـەی پێغەمبـەر ﷺ، وەك ئـەوەی یـەكێك بڵێـت: (خوایە گیان بۆ خاتری جاهی پێغەمبـەر ﷺ شـیفام بـدە)، ئـەوە بیدعەیـەو هـاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت نەیانكردووە.

ج. تەوەسول كردن بە دوعای پێغەمبەر ﷺ لە دوای مردنـی، وەك ئـەوەی یـەكێك بڵێت: (ئەی پێغەمبەر ﷺ دوعام بۆ بكەو بۆم بپاڕێرەوە).

---

(١) سورة الكهف: (١٠٣-١٠٤).

(٢) بە كورت كراوەیی و كەمێك دەستكاریەوە وەرگیراوە لە (منهاج الفرقة الناجية والطائفة المنصورة)، نوسـینی شـیخ محمد بن جميل زينو.

# بەشی چوارەم:

# شوبهەکانی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی لە تەوەسولی ڕێگە پێ نەدراوو ناشەرعیدا

ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی بۆ سەلماندنی بیرو بۆچونە پوچەڵ و ناشەرعیەکانیان و ئەم جۆری تەوەسولە داهێنراوو ناشەرعیەدا پشت بە کۆمەڵێك بەڵگە -بە گومانی خۆیان- دەبەستن، وە لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە ئاماژە بەم شوبهانەیان بدەم و ووتەی زانایان و پێشەوایان دەربارەیان بهێنمەوە، چونکە شوبهەکانیان یان صەحیحن بەڵام ئەوان لێکدانەوەی هەڵەی بۆ دەکەن، وە یان هەر لە بنچینەدا ضەعیفن و پشتیان پێ نابەسترێت، وە بە کورتی شوبهەکانیشیان ئەمانەن:

**شوبهەی یەکەم:**

ئەم پیاوە دەربارەی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾[1]، دەڵێت: (دەست گرتن بە وەسیلەوە بۆلای خوای پەروەردگار هەموو ئەو وەسیلانە دەگرێتەوە کە هۆکاری نزیك بوونەوەن لێی، جا جیاوازی نیە لە نێوان ئەوەی کە ئەم وەسیلانە کردەوە بن، یان ئەو کەسانە بن کە خاوەن پلەو جاهن لای خوای گەورە)[2].

**وەڵام:**

پێشتر ماناو تەفسیری ئەم ئایەتەمان باس کرد، وە بۆمان ڕوون بۆوە کە (وەسیلە) بریتیە لە نزیك بوونەوە لە خوای گەورە بە عیبادەت و طاعەت کردن، وە زانایانی تەفسیرو زمانەوانیش لەسەر ئەوە کۆك و هاوڕان، وە هیچ یەکێکیش لەمانە نەی ووتوە کە تەوەسول بە کەسانی خاوەن جاهو پلەو پایەش دەگرێتەوە.

وە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانیشی وا گومان دەبەن کە تەوەسول کردن بە کەسانی خاوەن پلەو پایەو جاهەوە، دوو مانا دەگرێتە خۆی:

(١) سورة المائدة: (٣٥).

(٢) شفاء الفؤاد (ص١٥٦).

**یەکەم**: دەیان کەن بە ناوەندو واسیتەیەك و لێیان دەپاڕێنەوەو هاواریـان دەکـەنێ و ئومێدیان پێیان هەیەو داوای بە فریا کـەوتنیان لـێ دەکـەن جگـە لـە خـوای گـەورە، ئەمەش بۆ ئەوەی لە خوای گەورە نزیکیـان بکەنـەوە، کـە ئەمـەش کرۆك و نـاوەڕۆکی شـیرك و هاوبـەش دانانـە بـۆ خـوای گـەورە، وە دیـنی موشـریك و هاوبـەش دانـەرە کۆنەکانە، هەروەك پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە.

**دووەم**: وە مانای دووەمی لای ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی ئەوەیە کە دەڵێن: ئێمـە داوا لە خوای گەورە دەکەین بەڵام بە جاهو مەنزیلەت و پلـەو پایـەی ئـەوان لای خـوای گەورە، هەروەك چۆن لە دوعاکانیاندا دەڵێن: (اللهم إني أسألك بحق فلان وجاهه عنـدك أن تغفر لي)، کە ئەم وتەیەش بیدعەیە، بەڵام ئەوان وا گومان دەبەن کە ئەمـە بەڵگـەی لەسـەرە، وە دواتـر ئـەم شوبهەیەشـیان هەڵدەوەشـێنینەوەو ڕەددی دەدەینـەوە بـە پشتیوانی خوای گەورە.

**شوبهەی دووەم:**

شوبهەیەکی تریان ئەوەیە کە دەڵێن: (عومەری کـوڕی خـەتتاب ڕەزای خـوای لـێ بێـت کاتێك کە باران نەدەباری داوای لە (عەباسی کوڕی عبدالمطلب) کرد کـە دەکاتـە مـامی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئـەوەی دوعـای بـاران بـارین بکـات و پێـی وت: (خوایـە گیـان ئێمـە تەوەسولمان بە پێغەمبەر ﷺ کـردو بارانـت بـۆ بارانـدین، وە ئێـستاش تەوەسـول بـە مامی پێغەمبەر ﷺ دەکەین و بارانمان بۆ ببارێنە)[1].

**وەڵام:**

ئەم ئەثەرە ئـەوە ناگەیـەنێت وەك ئـەم پیـاوەو هاوشـێوەکانی لێـی تێگەیـشتوون و وا گومان دەبەن کە تەوەسول کردن دروستە بە جاهو پلەو پایەی کەسانێك کـە خـاوەنی ئەو جاهو پلەو پایەیە بن، بـەڵکو هـەروەك پێـشتر ڕوونمـان کـردەوە ئەمـە پێچەوانەی قسەکەی ئەوانە، چونکە ئەگەر قسەکەی ئـەوان وابێـت و دروسـت بوایـە ئـەوا هـاوەڵان

---

(١) صحيح: رواه البخاري (٢/٤٩٤).

ڕەزای خوایان لێ بێت نەدەچون بۆ لای کەسێکی ترو هـەر تەوەسـولیان بـە پێغەمبـەر ﷺ دەکـرد لـە دوای مردنیشی، چـونکە جـاهو پلـەو پایـەی پێغەمبـەر ﷺ لـە دوای مردنیشی هەروەك خۆی ماوەتەوە لای خوای پەروەردگارو کەم نەبۆتەوە.

وە کە خەلیفە (عمر)یش ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت: (إنا كنا نتوسل بنبينـا) واتـە: بـە دوعای پێغەمبەر ﷺ، هەروەك بەڵگەکانی تر ئاماژە بەوە دەکەن کە پێشتر باسکراون، کە ئەمەش بە مردنی پێغەمبەر ﷺ کۆتایی هات، بۆیە (عمر) ڕەزای خوای لێ بێت بە (عباس)ی وت ڕەزای خوای لێ بێت.

وە هەروەها کە دەڵێـت: (إنا نتوسل اليك بعم نبينا)، واتـە: بـە دوعـای مـامی پێغەمبـەر ﷺ، هەروەك زۆر بە ڕوونی لە بەڵگەکانی تـردا دەردەکـەوێت، پاشـان (عبـاس) ڕەزای خوای لێ بێت دەپاڕێتەوەو دەڵێت: (اللهم إنه لم ينزل بلاء إلاّ بذنب...)الخ.

وە هەر بەم شێوەیەی کە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێـت لەسـەردەمی (عمـر)دا ڕەزای خوای لێ بێت کردیان، موسڵمانان لەسەردەمی (معاويه)دا ئاوایان کـردو چـوون بـۆ لای (يزيد بن الأسود الجرشي)و پێیان ووت: ئـەی یزیـد دەسـت بـەرز بکـەوە بـۆ لای خـوای گەورە، ئەویش دەستی بەرز کردەوەو دوعای کرد، خوای گەورە بارانی بۆ باراندن.

هـەموو ئـەو بەڵگانـەو بـە لـێ ووردبونـەوە لێیـان، بۆمـان دەردەکـەوێت و ڕوون دەبێتەوە کە تەوەسولیان کردووە بە دوعای ئـەوان نـەك بـە کەسـایەتی و جـاهو پلـەو پایەیان لای خوای گەورە، وەك ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی تەحریفی دەکەن و بـە هەڵـە لێکی دەدەنەوەو خۆیان و خەڵکیشی پێ گومڕا دەکەن.

**شوبهەی سێیەم:**

شوبهەیەکی تریان ئەوەیە کە دەڵێن: گوایە ئادەم سەلامی خوای لی بێت تەوەسولی بـە حەقی پێغەمبەر ﷺ کردووە، ئەویش لەو بەناو فەرمودەیەی کە گوایـە پێغەمبـەر ﷺ فەرمویەتی: (لما اقترف آدم الخطيئة قال: يا رب أسألك بحق محمد لمـا غفـرت لـي، فقـال

الله: يا آدم كيف عرفت محمداً ولم أخلقه؟...)[١]، واتە: (کاتێك ئادەم توشی هەڵەکە بوو وتی: ئەی خوایە گیان بە حەقی محمد داوات لێ دەکەم کە لێم خۆش بیت، خوای گـەورەش فـەرموی: ئـەی ئـادەم چـۆن محمـدت ناسـی لـە کاتێکـدا دروسـتم نەکردووە؟....).

ئـەم پیـاوە (وە هاوشێوەکانیـشی هـەمان گومـان و بۆچـونیان هەیـە) دەڵێـت: (لـەم فەرمودەیـەدا دەردەکـەوێت کـە تەوەسـول بـە پێغەمبـەر ﷺ کـراوە پـێش ئـەوەی جیهانیش بە لە دایك بوونی ئـەو شـاد بێـت......)، تـا ئـەو شـوێنەی کـە دەڵێـت: (وە لەوەوە ئەوە فێر دەبین کە ئەوانەی دەڵێن تەوەسول دروست نیە بە هیچ کەسێك تەنها لە کاتی ژیانیدا نـەبێت، ئـەوە قـسەی کەسانێکە کـە شـوێن هـەواو ئـارەزووی خۆیـان کەوتون و نەك ڕێنومابیەکانی خوای گەورە)[٢].

**وەڵام:**

ئەوەی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی دەیکەن بە بەڵگە فەرمودەیەکی باطل و مەوضـوعـە، وە ئـەم قـسەیەش کـە دەیکـات و دەڵێـت: (ئەوانـە شـوێن هـەواو ئـارەزووی خۆیـان کەوتوون)، ئەوە بەڕاستی خۆی و هاوشێوەکانی شایانترن کـە ئەمـەیان پـێ بوترێـت و وەصـف بکـرێن بـەوەی کـەوا شـوێن هـەواو ئـارەزووی خۆیـان و بگـرە شـوێن ڕێبـازی شەیتان کەوتوون!!! هەروەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە إنشاءالله.

وە هەروەها ئـەوەش کـە ئـەم بـەناو فەرمودەیـە بـەتاڵ دەکاتـەوەو ڕەتـی دەکاتـەوەو بەڵگەیە لەسـەری، ئەوەیـە کـە خـوای گـەورە لـە زۆر شـوێنی قورئـانی پـیرۆزدا باسـی هەڵەکەی ئادەم سەلامی خوای لێ بێت دەکات و لە هیچ شوێنێکیش باسی ئەوە ناکـات کە تەوەسولی بە غەیری خوای پەروەردگار کردبێت.

---

(١) ضعيف (موضوع): أخرجه الحاكم في (المستدرك) (٢/٦١٥)، وە هەروەها ئیمامی ذەهەبی و عەسقەلانی حوکمی بەتاڵیان داوە بەسەریدا. انظر سلسلة الأحاديث الضعيفة والموضوعة رقم (٢٥).

(٢) شفاء الفؤاد (ص١٥٨-١٥٩).

وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾[1]، واتە: (ئادەم بە چەند کەلیمەو وشەیەك لە خوای گەورە پاڕایەوەو ئەویش تەوبەکەی لێ قـەبوڵ کـرد، بەڕاسـتی خـوای گـەورە زۆر بـە بەزەییـەو تەوبـە قـەبوڵ دەکات).

وە ئەم وشانەش کە بەکاری هێناون لە بەرامبەر خوای گەورەدا بۆ ئەوەی لێی خـۆش بێت، ئەوەیە کە خوای گەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾[2]، واتـە: (وتیـان: پـەروەردگارا ئێمـە زوڵممان لە نەفسی خۆمان کردووەو ئەگەر تۆ لێمان خـۆش نـەبیت و بەزەییت پێمانـدا نەیاتەوە، ئەوا ئێمە لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندان دەبین).

کـەوابوو بـەم بەڵگانـە دەرکـەوت کـە ئـادەم سـەلامی خـوای لـێ بێـت تەوەسـولی بـە گـەورەترینی ئـەو شـتانە کـرد کـە تەوەسـولی پـێ دەکرێـت کـە ئـەویش نـاوی خـوای پـەروەردگارە، وە وتـی (رَبَّنَا) لەگـەڵ دان نـان بـە تـاوان و بـێ دەسـەڵاتی خـۆی بـۆ ڕەحمەت و سۆزو لێ خۆش بوونی پەروەردگاری، کە ئەمەش تەوەسـولی پێغەمبـەران و پیاو چاکانە، کە قورئـان و سـوننەت و هـەموو بەڵگـەکان بەڵگەنـە لەسـەری، نـەك بـەم شێوەیەی کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی لێی تێگەیشتوون و باسی دەکەن.

**شوبهەی چوارەم:**

ئەم شوبهەیەشیان بریتیە لەو ئەثەرەی کە گوایە (ابـن عبـاس) ڕەزای خـوای لـێ بێـت دەیگێڕێتەوەو دەڵێت: (جولەکـەکانی خەیبـەر شـەڕیان دەکـرد لەگـەڵ (غطفـان)، هـەر کاتێك ڕوو بەڕووی یەکتر دەبونـەوە جولەکـەکانی خەیبـەر شکستیان دەهێنـا، پاشـان جولەکەکان داوای پەنا گرتنیان دەکرد بەم دوعایە: (اللهم إنا نسألك بحـق محمـد النبـی

(١) سورة البقرة: (٣٧).

(٢) سورة الأعراف: (٢٣).

الأمي الذي وعدتنا أن تخرجه لنا في آخر الزمان إلاّ نصرتنا عليهم)، پاشان دەڵێت: ئنجا هەر کە بەیەك دەگەیشتن بە هۆی ئەم دوعایەوە سەردەکەوتن بە سەریانداو شکستیان پێ دەهێنان، کاتێکیش خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ بۆ ناردن کافر بوون پێ و بڕوایان پێ نەهێنا، خوای گەورەش ئەمەی دابەزاند: (وقد كانوا يستفتحون بك يا محمد على الكافرين)[1].

**وەڵام:**

گومانی تیادا نیە کە ئەم ئەثەرەش[2] مەوضوعەو بە هیچ شێوەیەك پشتی پێ نابەسترێت و ناکۆکە لەگەڵ بەڵگە ڕاستەکانی تردا کە هەموویان پێچەوانەی ئەون، بەڵام ئەوەی جێگای سەر سوڕمان و لێ وورد بونەوەیە ئەوەیە کە کەسێك خۆی بە عالم و زانا بزانێت و کەچی شتێکی ئاوا بکات بە بەڵگە بۆ کارەکانی!!! وە ئەگەر صەحیح و ڕاستیش بوایە خۆ ئەوە تەنها کارو کردەوەی جولەکەکانە، کەواتە چ کاتێك بووە کارو کردەوەی جولەکەکان بوبێت بە بەڵگە لەناو دیندا؟

جگە لەمانەش چەندین شوبهەو گومانی تریشیان هەنە کە دەیانکەن بە بەڵگەو پاساو هێنانەوە بۆ کارە بەدو ناشەرعیەکانیان، بەڵام لەبەر درێژبونەوەی بابەتەکە هەر بەو شوبهانە واز دەهێنین، وە هەر کەسێکیش دەیەوێت هەموو شوبهەکانیان ببینێت و شارەزایان بێت، ئەوا دەتوانێت بگەڕێتەوە سەر کتێبی (التوسل أنواعه وأحكامه) لە نوسینی زانای فەرمودەناس و پایە بەرز شێخ محمد ناصرالدين الألباني ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

---

(١) شفاء الفؤاد (ص١٥٩).

(٢) ضعيف (موضوع): رواه الحاكم في المستدرك (٢/٢٦٣)، من طريق عبدالملك بن هارون بن عنترة عن أبيه عن جده عن سعيد بن جبير عن ابن عباس. قال الحاكم: (أدت الضرورة إلى إخراجه في التفسير، وهو غريب من حديثه، وتعقبه الذهبي فقال: (لا ضرورة في ذلك، فعبد الملك متروك هالك). وعبد الملك بن هارون، كذبه ابن معين والسعدي وابن حبان وضعفه غيرهم، وقال الحاكم عنه: (ذاهب الحديث جداً، روى عن أبيه أحاديث موضوعة). (أنظر الميزان (٢/٦٦٦)، واللسان (٤/٧١)، والمجروحين (٢/١٣٣).

# بەندی هەشتەم

## شەفاعەت

بەشی یەکەم

شەفاعەت لە دیدی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی

بەشی دووەم

شەفاعەت لای ئوممەتانی پێشوو

بەشی سێیەم

مەرجەکانی شەفاعەت کردن

بەشی چوارەم

جۆرەکانی شەفاعەت

# بەشی یەکەم:

# شەفاعەت لە دیدی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی

یەکێ لەم شوبهانەی کە ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی هەر لە کۆنەوە تا ئێستاش کە باسی دەکەن و بە هەڵە خەڵکی لێ تێ دەگەیەنن" بریتیە لە بابەتی شەفاعەت، ئەویش بەوەی کە هەندێ لەو بەڵگانەی کە باس لـە جـێگیر بـوونی شـەفاعەتی پێغەمبـەر ﷺ دەکەن کە حەق و ڕاستن و گومانیان تیادا نیە، بەڵام ئەوان دێن ماناکەی دەگۆڕن و لـە مەبەسـتە ڕاسـتەقینەکەی خـۆی لای دەدەن و بـە هـەمان شـێوەی ئـەو موشـریکە گومڕایانە لێکی دەدەنەوەو تەفسیری دەکەن کە داوای شـەفاعەتیان لـە غـەیری خـوای گەورە دەکردو هاوارو دوعاو پاڕانەوەو ئومێدو هیوایان بە غەیری خوای گـەورە هـەبوو، وە داوای بە هاناوە هاتن و فریاکەوتن و کۆمەکیان لێ دەکردن.

وە ئەم پیاوەش لـە کتێبەکەیـدا ناونیـشانێکی هێنـاوە بـە نـاوی: (زیـارة النبويـة)، کـە دەڵێت: (هاتووم بۆ لات و زیارەت کردنت و پەنات پێ دەگرم و هـاتووم لـە گوناهـەکانم خۆش بیت، وە داوات لێ دەکەم گە شەفاعەتم بۆ بکەیت لـە لای پـەروەردگارم، وە تـۆ شەفاعەتکاری تاوانبارانی و شەفاعەتی تۆ قەبوڵە لـە لای پـەروەردگاری جیهانیـان، وە ئەوەتا من دان دەنێم بە تـاوان و گوناهـەکانم و تـۆ دەکـەم بـە وەسیلە بـۆ لای خـوای گەورە، وە تۆش دەکەم بە شەفاعەتکار لای ئەو...... دەسا شـەفاعەتم بـۆ بکـە ئـەی نێـردراوی پـەروەردگاری جیهانیـان و شـەفاعەتکاری تاوانبـاران، وە ئـەوەتا مـن لـە خزمەتی تۆدام و لەبەر دەرگای تۆدام.....)، پاشان هۆنراوەیەك دەنوسێت و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| أنت الـشفيع وآمـالـي معلقة | وقد رجوتك يا ذا الفضل تشفع لي |
| هذا نزيلك اضحى لا ملاذ له | إلاّ جنابـــك يا سـؤلي ويا أمـــلي |
| ضعيف غريب قــد أناخ بكـــم | ومستجـير بكـــم يا ســادة الــعرب |
| يا مكرمي الضيف يا عون الزمان | ويا غوث الفقير ومرمى القصد والطلب |
| هذا مقـــام الذي ضاقت مذاهبه | وأنتم في الـــرجا من أعظم الـــسبب[1] |

---

(١) شفاء الفؤاد (ص١٠٩).

وە هەروەها لە شوێنێکی تردا دەڵێت: (ئێمە هاتوینەتە لات ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەردانت، هاتوین بۆ بە جێ گەیاندنی حەقی تۆو تەبەروك كردن بە سەردانی تۆ، وە داوای شەفاعەت دەکەین بە هۆی تۆوە لەو بارە گرانەی کە لە سەرمانەو لەو ستەمەی کە لە دڵەکانی خۆمانمان کردووە، وە هیچ شەفاعەتکارێکمان نیە جگە لە تۆ کە هیوامان پێی بێت، وە هیچ ئومێدێکیشمان نیە جگە لە دەرگای تۆ کە بمان گەیەنێت، وە ئێمان خۆشبەو شەفاعەتمان بۆ بکە لای پەروەردگارت)[1].

ئەمە ئەم شتە بێ بنەماو پڕ لە شیرکەیە کە ئەم پیاوە باسیان دەکات و لە زۆر شوێنی تریش دووبارەیان دەکاتەوەو بابەتەکەی پێ درێژ دەکاتەوە، وە هاوشێوەکانیشی لێرەو لەوێ هەمان قەوانە سواوەکەی ئەو لێ دەدەنەوەو دوو پاتی دەکەنەوە، لە کاتێکدا ئەمە هەر ئەو شیرکەیە کە موشریکە کۆنەکانی لەسەر بوون و جگە لە خوای گەورە چەندەها پەرستراوی تریان بۆ خۆیان دادەناو ناویان دەنان شەفاعەتکارو پیاو چاك و هاواریان دەکردنێ و تەوەسولیان پێ دەکردن و داوای شەفاعەتیان لێ دەکردن بۆ ئەوەی لە خوای گەورەیان نزیك بکەنەوە.

وە ئەمەش ئەم شەفاعەتە شیرکیەیە کە قورئانی پیرۆز نەهی لێ دەکات کە میرات و جێماوی موشریکە کۆنەکانە لە هەموو سەردەمەکاندا، وە پێچەوانەی ئەم شەفاعەتەیە کە بە بەڵگەی قورئان و فەرمودە جێگیر بووەو سەلمێنراوەو دانی پیادانراوە، کە لە بەشەکانی داهاتودا بە پشتیوانی خوای گەورە باسی دەکەین.

---

(١) شفاء الفؤاد (ص١١٧).

لە بەشەکانی پێشوودا ئەوەمان بۆ ڕوون بۆوە کە موشریکەکانی پێشوو، وە ئەوانەش کە خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ بۆ ناردن، بڕوایان وانەبوو کەوا ئەو پەرستراوانەی ئەوان دەیانپەرستن دروستکارو ڕۆزی دەرو ژیێنەرو مرێنەرو بەڕێوەبەری کاروباری دونیابن، بەڵکو بە پێچەوانەوە دڵنیا بوون و دانیان دەنا بەوەی کە هەموو ئەمانە تایبەتمەندی خوای گەورەن بە تەنها، وە ئەمەش قسەیەك نیە بێ بەڵگەو لە خۆڕا بکرێت، بەڵکو چەندەها بەڵگە هەیە لەسەر ئەمەو لە زۆر شوێنی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە.

بۆ نمونە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾[1]، واتە: (بەو موشریك و هاوبەش دانەرانە بڵێ: كێ ڕزق و ڕۆزیتان دەدات لە ئاسمانەکان و زەوی؟ وە کێ بیستن و بینینی دروست کردووەو خاوەنیەتی؟ وە کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت؟ وە کێ تەدبیری هەموو کاروبارەکان دەکات و بەڕێوەیان دەبات؟ ئەوا لە وەڵامدا دەڵێن: (الله)، ئنجا پێیان بڵێ: ئەی کەوایە بۆ لە خوا ناترسن و عیبادەت تەنها بۆ ئەو ئەنجام نادەن؟).

بەڵام ئەمان پەرستراوەکانیان دەکردن بە شەفاعەتکارو تەوەسولیان پێ دەکردن بۆلای پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی، وەك خوای گەورە لە زۆر شوێندا باسی ئەوەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ ﴾[2]، واتە: (ئەوانەی کە غەیری خوای گەورەیان دەکرد بە شەفاعەتکار دەیان وت: خۆ ئێمە نایان پەرستین بەڵکو بۆ ئەوەیە کە لە خوامان نزیك بخەنەوە).

(١) سورة يونس: (٣١).

(٢) سورة الزمر: (٣).

وە هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعْلَمُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾[1]، واتە: (موشریكەكان جگـە لـە خـواى گەورە عیبـادەت بـۆ شـتێك دەكـەن كـە نـە قازانجیـان پـێ دەگـەیـەنێت وە نـە زەرەرو زیانیشیان لەسەر لادەبات، وە دەڵێن: ئەمانـە شـەفاعەتكارمانن لاى خـواو لـە خوامـان نزیك دەخەنەوە، وە ئایا ئێوە ڕێگا بۆ خوا دادەنێنن و شتێكى فێر دەكـەن كـە خـۆى نەیزانێت؟ بەڵكو خواى گەورە زاناو شارەزایە بە هەموو ئەو شتانەى كە لە ئاسمانەكان و زەویدان، وە پاك و بێگەردى بۆ خواى گەورە لەوەى كە موشریك و هاوبـەش دانـەران دەیكەن و دەیڵێن).

ئەوەتا خواى گەورە نەهى لێ كردن كە غـەیرى خـواى گـەورە بكـەن بـە شـەفاعەتكارو هاواریان بكەنێ و ئومێدو هیوایان پێیان بێت، چونكە ئەمـە عیبـادەت كردنـە بـۆ بـت و پەرستراوەكانیان، وە خواى گەورەش بە هاوبەش دانان (الشرك) ناوى بـردو فـەرموى: ﴿سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾.

وە كە خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بە بێ ئیزن و فەرمان و ڕێگە پێدانى خواى گەورە، بۆیە نەهى لێ كردن كە بیان كەن بە شەفاعەتكار بـەم شـێوەیە، چونكە شەفاعەت بە هیچ شێوەیەك ناكرێت تەنها بە ڕەزامەندى و ئیزنى خـواى گـەورە نەبێت، كەواتە تەنها بەم شێوەیە شەفاعەت قەبوڵ دەبێت لاى خواى گەورە.

وە هـەروەها خـواى گـەورە لـە ئایـەتێكى تـردا دەفـەرموێت: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَ ۚ قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَمْلِكُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَعْقِلُونَ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ۖ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾[2]، واتە: (ئایا ئەو موشریكانە جگە لە

---

(١) سورة يونس: (١٨).

(٢) سورة الزمر: (٤٣- ٤٤).

خوای گـەورە ئەوانـەی کـە دەیـان پـەرستن و دەیـان کـەن بـە شـەفاعەتکارو هاواریـان دەکەنێ تا پێی لە خوا نزیك ببنەوە؟ ئەی محمد ﷺ بەو موشریکانە بڵـێ: ئایا ئەوانـە بە شەفاعەتکاری خۆتان دەزانن لە کاتێکدا هیچیان بە دەست نیەو ئاگاشیان لـە هـاوار کردنـی ئێـوە نیـە، وە پێیـان بڵـێ: شـەفاعەت هـەمووی مـوڵکی خوایـەو هـەر خـۆی خاوەنیـەتی، وە هـەر ئـەویش خـاوەنی ڕاسـتەقینەی زەوی و ئاسمانەکانـە، وە لـە کۆتاییشدا گەڕانەوە هەر بۆ لای ئەوە).

وە خـوای گـەورە ئەمـە زیـاتر تەئکیـد دەکاتـەوەو دەفـەرموێت: ﴿ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا ﴾، واتە: تەنها خوای گەورە خاوەنی هەموو شەفاعەتێکە، نەك هـی ئەوانـە بێـت کە ئێوە هاواریان لـێ دەکـەن و لێیـان دەپاڕێنـەوە، وە هـیچ شتێکیـشیان بـۆ ناکرێـت ئەگەرچی ئەوانە خاوەن جاهو پلەو پایـەی بـەرزو نـزیکیش بـن لای خـوای گـەورە، وە ناتوانن شەفاعەت بکەن و سەربەخۆ نین تیایدا تـەنها دوای ڕەزامەنـدی و ئیزنـی خـوای گەورە نەبێت، وە هەروەها دەبێت ڕازیش بێت لەسەر ئەوەی کە ئـەم شـەفاعەتە بـۆ چ کەسێك دەکرێت.

پاشـان خـوای گـەورە ئەمـە زیـاتر تەئکیـد دەکاتـەوە، وەك دەفـەرموێت: ﴿ لَّهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، بەمەش هەموو ئەمانە بەتاڵ دەکاتەوە کە ئەوان لەسەری بوون لەوەی کـە ئـەوانیان کـردوون بـە شـەفاعەتکارو شـەفاعەتیان پـێ کردوون، چونکە مادام خوای گەورە خاوەنی هەموو شتێکەو شەفاعەتیش هـەمووی بـە دەستی ئەوە، کەواتە هەموو ئەمانە بەتاڵ دەبنەوە ئەگەرچی شەفاعەتکارو شـەفاعەت بۆ کراو هەر کەسێك بن و خاوەنی هەر جاهو پلەو پایەیەکی بەرزیش بن.

وەك پێشتر باسمـان کرد کـە شـەفاعەت کـردن هـەروا شـتێکی ئاسـان نیـەو هـەر کەسێك ڕاست بۆوە خۆی بکات بە شەفاعەتکار یـان داوای شـەفاعەت لـە کەسـێکی تـر بکات، بەڵکو بۆ قەبوڵ بوونی شـەفاعەت دەبێـت دوو مـەرجی سـەرەکی هـەبن تـا ئـەو شەفاعەت کردنە دابمەزرێت، ئەوانیش:

**یەکەم: ئەو کەسەی کە شەفاعەتەکە دەکات دەبێت خوای گەورە ئیزنی بدات:**

لە زۆر شوێنی قورئـانی پـیرۆزدا خـوای گـەورە باسـی شـەفاعەتی کـردووەو مـەرجێکی سەرەکیش کە لەگەڵیدا باسی کردووە بریتیە لەوەی کە پێویستە خـوای گـەورە ئیزنـی ئەو کەسە بدات کە شەفاعەت دەکات، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾[1] واتـــە: (هـــیچ کەسێك ناتوانێت شەفاعەت بکات تا ئـەو کاتـەی خـوای گـەورە ئیزنـی دەدات، وە هـەر ئەو پەروەردگارتانەو بە تەنهاش ئەو بپەرستن، ئەی کەوایە بۆ بیر ناکەنەوە؟).

وە هەروەها دەفـەرموێت: ﴿ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ ﴾[2]، واتە: (هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە موڵکی خوای گەورەیـە، وە کـێ دەتوانێت شەفاعەت بکات لای خوای گەورە تا خـوای گـەورە ئیـزن و فـەرمانی لەسـەر نەدات؟).

ئەم ئایەتـەش نـەفی شەفاعەتی شیرکی دەکات، ئەویش بەوەی کە کەسـانێك دەکـەن بـە شەفاعەتکار جگە لە خوای گەورە، وە هەروەها شەفاعەتی شەرعی و ڕێگـە پێـدراویش جێگیر دەکات و دەیسەلمێنێت کـە ڕێگـە پێدراوە بـۆ هـەر کەسێك کـە خـوای گـەورە بیەوێت لە پێغەمبەران و پیاو چاکان.

---

(١) سورة يونس: (٣).

(٢) سورة البقرة: (٢٥٥).

يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴾[1]، واتــــە: (وە موشــــریکەکان دەیان وت: خوا منداڵی هەیەو فریشتەکان کچی ئەون، پاکو بێگەردی بۆ خـوای گـەورە لەوەی کە ئەوان دەیڵێن، بەڵکو ئەو فریشتانە عەبدو بەندەی بـەڕێزی خـوای گـەورەن، وە پێش هیچ وتەیەکی خوای گەورە ناکەون و هـەموو ئـەمرو فەرمانـەکانی جـێ بـەجێ دەکەن، خوای گەورە زاناو بە ئاگایە بە هەموو کارە ڕابردوو داهاتووەکـانی بەنـدەکانی وە شەفاعەت ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە خوای گەورە لێی ڕازیە).

کەواتە پوختەی بابەتەکـە ئەوەیـە کـە بەڕاسـتی ئـەم شـەفاعەتەی کـەجێگیرەو خـوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردووە، وابەستەیە بە دوو مەرجەوە:

**یەکەم**: ئیزنی پەروەردگار بۆ ئەو کەسەی کە شەفاعەت دەکات.

**دووەم**: ڕازی بوونی خوای پەروەردگار بەو کەسەی کە شەفاعەتی بۆ دەکرێت.

وە گومانیشی تیادا نیە کەوا خوای گەورە ڕازی نابێت تەنها بۆ ئیمانـدارانی ڕاسـتەقینە نەبێت، وە ئیزن نادات کە شەفاعەت بۆ کافرو موشریك و مونافیقان بکرێت، ئەگەرچـی شەفاعەتکار خاوەن جاهو پلەو پایەی بەرز بێت و نزیکیش بێت لە خـوای گـەورە، وەك فریشتەو پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت.

---

(١) سورة الأنبياء: (٢٦ – ٢٨).

**دووەم: شەفاعەت ناکرێت بۆ هیچ کەسێك تا خوای گەورە پێی ڕازی نەبێت:**

وە مەرجێکی تر بۆ قەبوڵ بوونی شەفاعەت جگە لەو مەرجەی پێشوو، ئەوەیە کە دەبێت خوای پەروەردگار ڕازی بێت کە ئەو شەفاعەتە بۆ چ کەسێك دەکرێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغۡنِي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ أَن يَأۡذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرۡضَىٰٓ ﴾[1]، واتە: (چەندەها فریشتە لە ئاسمانەکاندا هەن، وە ئەگەر شەفاعەت بۆ هەر کەسێك بکەن ئەوا شەفاعەتەکەیان هیچ سودێك ناگەیەنێت تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە ئیزنی لەسەر دەدات بۆ ئەو کەسانەی کە ئارەزووی لێیەتی و لێی ڕازیە).

خوای گەورە نەفی شەفاعەتی فریشتە نزیکەکانی کرد تا دوای ئیزن پێدانی بە شەفاعەت کردن و ڕازی بوونیشی لەسەر ئەو کەسەی کە شەفاعەتی بۆ دەکرێت، وە دیسان لێرەشدا خوای گەورە دوو مەرجی باس کرد کە ئەوانیش: ئیزن دان و ڕازی بوونە.

(ابن الجوزي) دەڵێت: (ئەمە بە واتای ئەوەیە کە ئەوان شەفاعەت ناکەن تەنها بۆ ئەو کەسە نەبێت کە خوای گەورە پێی ڕازییە)[2].

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ يَوۡمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَرَضِيَ لَهُۥ قَوۡلًا ﴾[3]، واتە: (لەو ڕۆژەدا واتە لە قیامەتدا هیچ شەفاعەتکارێك سودی نیە تەنها ئەوە نەبێت کە خوای گەورە ئیزنی دەدات و ڕازیە بە شەفاعەتەکەی).

وە هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا

---

(١) سورة النجم: (٢٦).

(٢) زاد المسير (٨/٧٤).

(٣) سورة طه: (١٠٩).

# بەشی چوارەم:

# جۆرەکانی شەفاعەت[١]

---

(١) بە کورت کراوەیی و کەمێك دەسکاریەوە لە کتێبی (خواپەرستی نەك شەخس پەرستی) وەرگیراوە.

ئەگەر وردبینەوە لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان دەبینین دوو جۆر شـەفاعەت باسـکراوە لە قورئاندا:

**جۆری یەکەم: ئەو شەفاعەتەی کە داواکردنی شیرکە (الشفاعة الشركية):**

ئەم جۆریان ئەوەیە کە داوا بکرێت لە غەیری خواو هاوار بکرێتە پیاو چاکان و فریشتەو جنۆکەو قەبر، بۆ ئەوەی شەفاعەت بکەن لای خوا بۆ ئەو کەسەی کە هاوارکەرە، واتـە: بەبێ ئیزن و فەرمانی خوا واسیتەو شەفاعەتکار دابنرێت بـۆ ئـەوەی شـەفاعەت بکـەن لای خواو شەفاعەت دانەریش سەربڕین و ماڵ بەخشین و هاوار کردن و بە گەورە دانـان بکات بۆ ئەم شەفاعەتکارانە، وە دڵی ببەسـتێتەوە بـەوان و ئیعتقـادی پێیـان بێـت کـە سوودی بۆ دابـین بکـەن و زەرەری لەسـەر لابـدەن بـەهۆی شـەفاعەت کردنیانـەوە لای خوا، وە شەفیعەکانی خۆش بوێت لەگەڵ لێ ترسان و بە گـەورە دانانیـان و پـشت پـێ بەستنیان!!

وە ئەم جۆرەش خـوای گـەورە بـە شـیرکی دانـاوەو کـوفرەو دیـنی موشـریکەکانی کۆنەو لە جیاتی سود گەیاندن زەرەر دەگەیەنێت، وە لە جیاتی نزیك کردنەوە لـە خـوا دوورت دەخاتەوە لێی.

وە پەروەدگار لە چەندان ئایەتدا ئەم شەفاعەتە شیرکیەی باس کردووە، بۆ نمونە:

خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُبْلِسُ الْمُجْرِمُونَ وَلَمْ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَائِهِمْ شُفَعَاءُ وَكَانُوا بِشُرَكَائِهِمْ كَافِرِينَ ﴾[1]، واتە: (لەو ڕۆژەدا کە کـاتی زیندوو بونەوەیە تاوانبارەکان بێ ئومێد دەبن لە ڕزگار بوونیـان لـە سـزا، وە سەرسـام دەمێنن و هیچ پەناو دەروازەیەکیان دەست ناکەوێت و بەڵگەیەکیان نامێنێت).

وە لەو ڕۆژەدا ئەو مەعبودانەی کە لـە دونیـا دەیـان پەرسـتن و هاواریـان دەکردنـێ و ئومێـدی شـەفاعەت کردنیـان پێیـان بـوو =بۆیـە جۆرەهـا پەرسـتنیان بـۆ دەکـردن و

(١) سورة الروم: (١٢- ١٣).

کردبویانن بە شەریك بۆ خوا لە پەرستن و پشت پێ بەستندا= لەو ڕۆژەدا شـەفاعەتیان بۆ ناکەن و نابن بە شەفاعەتکاریان بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبن بە دوژمنیان و بەڕائەتی خۆیـان دەردەبڕن لـەو هاوبـەش پەیداکەرانـەی کـە لـە دونیـادا هاواریـان دەکردنـێ و کردبویانن بە شـەفاعەتکارو شـەریکی خـوا" چونکە شـەفاعەت مـوڵکی خوایـەو نابێـت بکرێتە موڵکی غەیری ئەو.

وە کە هاوبەش پەیداکەران بێ ئومێد بوون لە مەعبودەکانیان و بینیان بەڕائـەتیان لـێ دەکەن، ئەو کاتە ئەوانیش بەڕائەت لە مەعبودەکانیان دەکەن و دەڵێن: ئێمە لـە دونیـا ئێوەمان دەپەرست و پـشتمان پـێ دەبەسـتن بـۆ ئـەمڕۆ، بـۆ ئـەوەی شـەفاعەتمان بـۆ بکەن، نەك بەڕائەتمان لێ بکەن!

وە هەروەها خـوای گـەورە لـە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَىٰ كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَتَرَكْتُم مَّا خَوَّلْنَاكُمْ وَرَاءَ ظُهُورِكُمْ ۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمْ شُفَعَاءَكُمُ الَّذِينَ زَعَمْتُمْ أَنَّهُمْ فِيكُمْ شُرَكَاءُ ۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيْنَكُمْ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴾[1]، واتـە: (لـە ڕۆژی قیامەتدا پەروەردگار بە هاوبـەش پەیداکـەران دەڵێـت: سوێند بـەخوا، بێگومـان ئێوە بە تـاك تـاك دەگەڕێنـەوە لای ئێمـە، هـەروەکو یەکـەمجار دروسـتمان کـردن، وە هەرچی پێمان بەخشیبوون و لە بەر دەستتان دابوو بەجێتان هێشت دوای خۆتـان، وە شەفاعەتکارەکانیش نابینین لەگەڵتاندا، ئەو فریشتەو جنۆکەو پێغەمبەرو پیاوچاکانەی کە ئیعتیقادتان پێیان بوو، وە وا گومانتان دەبرد کە تکاتان بۆ بکەن و فریاتان بکەون کاتێ لەگەڵ خوا هاوارتان دەکردنێ و کردبوتانن بە شەریکی خوا لـە ئیعتیمـاد خـستنە سەرو هانا بۆ بردن و داوا لێ کـردن! سـوێند بـە خـوا هەرچی پەیوەندیـەك هـەبوو لـە نێوانتاندا پچڕا، وە هەرچی ئومێدێکتان پێیان بوو وون بوو پێچەوانەش بۆوە).

(١) سورة الأنعام: (٩٤).

**جۆری دووەم: شەفاعەتی شەرعی:**

شەفاعەتی شەرعی ئەو جۆرە شەفاعەتەیە کە قورئان و حەدیس ئاماژەیان بە بوونی کردووە لە ڕۆژی قیامەتدا، وە مانای ئەم شەفاعەتەش ئەمەیە کە: (پەروەردگار خۆی ڕێزو چاکەو فەزڵ دەنوێنێ لەسەر ئەهلی ئیخلاس و تەنها خوا پەرستدا، بەوەی کە لێیان دەبورێت بە هۆی دوعاو تکای ئەو تکاکارەی کە خۆی ڕوخسەتی داوە تکا بکات بۆ ئەوەی ڕێز بنێت لە تکاکارو بیگەیەنێت بە پلەی سوپاس کراو بە هۆی تکا کردنەکەی)[1].

وە هەروەها شێخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي دەڵێت: (ئەو شەفاعەتەی کە هەیە ئەوەیە کە بە ڕوخسەتی خوا دەبێت، وە بریتیە لەو شەفاعەتەی کە تەنها بۆ ئەهلی ئیخلاس (تەنها خوا پەرستان) دەکرێت بە تایبەتی، وە ئەو شەفاعەت کردنەش هەمووی هەر لە خواوەیەو مەبەستیش لەو ڕوخسەت دانی تکا کردنە: ڕێز لێنان و ڕەحم کردنە بە تکاکار، نەك (ترسان لە تکاکار، یاخود ئیش پێ بوونی، یاخود ناچاری بێت. وە هەروەها ئەم ڕوخسەت دانی شەفاعەت کردنەش ڕەحمی خوایە بۆ شەفاعەت بۆ کراوو عەفو کردنیەتی، کەواتە پەروەردگار هەر تەنها خۆی سوپاس کراوە لەسەر ئەم ڕوخسەت دانی تکا کردنە، وە هەر خۆیشی ئیزنی پێغەمبەر ﷺ دەدات شەفاعەت بکات بۆ ئەوەی بگات بە پلەی بەرزی سوپاس کراو)[2].

ئەمەیە شەفاعەتی شەرعی و ڕێگە پێدراو، وە تەنها ئەو کەسانەش دەکەونە بەر ئەو شەفاعەتەو بەختەوەر دەبن پێی کە تەنها (الله) پەرستراوو خۆشەویستیان بووە، وە تەنها عیبادەتی ئەویان کردووە بە خالیسی، وە شەریکیان بۆ دانەناوەو لە غەیری ئەو هاواریان نەکردۆتە کەس بۆ شەفاعەت کردن، وەك لەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێت:

---

(١) وتەی شیخ الإسلام ابن تیمیة، بڕوانە (مجموع الفتاوى).

(٢) القول السديد لمفسر العلامة عبدالرحمن بن ناصر السعدي (ص٦٣).

❁ أبو هريرە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: وتم ئەی پێغەمبـەری ﷺ: (مـن أسـعد النـاس بشفاعتك؟)، واتە: کێ بەختەوەرترین کەس دەبێت بە شەفاعەتی تۆ؟ (قال: مـن قـال: لا إله إلاّ الله خالصاً من قلبه)، واتە: ئـەو کەسـەی کـە بڵـێ: (لا إلـه إلاّ الله) واتـە: هـیچ پەرستراوێکی حەق نیە تەنها (الله) نەبێت وە بە خالیسی لە دڵـەوە ئـەم شـاهیدی دانـە دەربچێت.

کەواتە ئەگەر وتنی (لا إله إلاّ الله) لە دڵێکی بە ئیخلاس و تەنها ڕوو لـە خـواو ئیعتیقـاد بە خوا بوو دەرنەچێت، بەختەوەر نابێت بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ.

وە هەر کەسێك شەریك بۆ خوا دابنێت و هاوار بکاتە غەیری خواو ئیعتیقادی بە غـەیری خوا بێت، ئەوە بە هیچ شـێوەیەك بـەر شـەفاعەتی پێغەمبـەر ﷺ ناکـەوێت، وەك لـەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێت:

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (لکل نبی دعـوة مـستجابة فتعجَّـل كـل نبـيّ دعوتَـه، وإنـي اختبأتُ دعوتي شفاعة لأمتي فهي نائلة -إن شاءالله- من مـات مـن أمـتي لا يـشرك بـالله شيئاً)[1] ، واتە: بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوعایەکی گیرا (وەڵام دراوە) هەبووە، وە هەموو پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لێ بێت دوعای خۆیان کردو وەڵامیان وەرگرتەوە. بەڵام من دوعا گیرا بووەکەی خۆم هەڵگرتووە (شاردومەتەوە) بۆ تکـا کردنـی ڕۆژی قیامـەت بۆ گەلەکەم، وە تکاکەم (شەفاعەتەکەم) -إن شـاءالله- بـە هـەموو یـەکێك دەگـات کـە مردبێت و هیچ شەریکی بۆ خوا پەیدا نەکردبێت واتە لەسەر شیرك نەمردبێت.

(١) صحيح: رواه مسلم

**خوێنەری گران و سەنگین:**

دوای ئەوەی گەیشتیت بە کۆتایی ئەم کتێبەو لە خوێندنەوەی بویتەوە، بینیت و بۆت دەرکەوت کە ئەمە چەند قسەیەکی ئەم پیاوە (محمد العلوي المالكي) بوو کە تەنها لەم دوو کتێبەی وەرگیرابوون و بەس، کە پڕن لە کوفری ئاشکراو شیرك و دژایەتی کردنی بنچینەکانی ئیمان و پایەکانی ئیسلام، ئەی باشە ئەگەر بگەڕێینەوە سەر کتێبەکانی تری و ئەو کتێبانەش کە هاوشێوەکانی و دەروێشەکانی ئەم پیاوە نوسویانن، دەبێت چەند زیاترو زۆرتر لەمە کوفرو گومڕاییان تیادابێت؟

وە گومانی تیادا نیە کە ئەوەی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی دەینوسن، هەمووی درێژ کراوەی ئەم بیرو باوەڕە بۆگەنەیە کە (حلاج و ابن الفارض و ابن عربي و تلمساني)و هاوشێوەی ئەوان هەیان بووە، کە بە شێوازێك قسە دەکەن بە هیچ شێوەیەك خەتەرەش ناکات بەسەر دڵی ئیمانداری ڕاستەقینەدا. وە هەموو ئەو شوبهانەش کە دەیان هێننەوەو بە گوێچکەی خەڵکیدا دەیچرپێنن، لە بەرامبەر بەڵگەی حەق و ڕاستدا لە تەونی جاڵجاڵۆکە سوکترو لاوازترن، وە لە بەرامبەریاندا خۆیان ناگرن و تەنها لە شێوەی سەرابێکدا دەردەکەون و بەس، ﴿يَحْسَبُهُ الظَّمْآنُ مَاءً حَتَّى إِذَا جَاءَهُ لَمْ يَجِدْهُ شَيْئًا وَوَجَدَ اللَّهَ عِندَهُ فَوَفَّاهُ حِسَابَهُ﴾[1].

وە بۆمان دەرکەوت کە ئەم بەڵگانەی دەیانهێننەوە بۆ پشتگیری کردن و سەرخستنی بیرو بۆچونە گومڕاکانیان، یان بەڵگەیەکی صەریح و ڕاشکاوانەیە بەڵام صەحیح و ڕاست نیە، یان صەحیحە بەڵام بە ڕاشکاوی و صەریحی پشتگیری لە بیروبۆچونەکانیان ناکات، بەڵکو بەپێی ئارەزوو بەرژەوەندی خۆیان تەحریفی دەکەن و دەیگۆڕن، وە هەندێکیشیان نە صەحیحن و نە بەڵگەشن لەسەر کارەکانیان.

---

(١) سورة النور: (٣٩).

❀ بۆ نمونە ئەو بەڵگانەی کە دەیان هێننەوە بۆ خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺ، هیچ ئاماژەیەکیان تیادا نەبوو بۆ دروست بوونی زیادەڕەوی کردن و تێپەڕاندن لە مەدح و باس کردنیدا، وە هەروەها ئایەتەکانیش کە بە گەورە دانان و خۆشویستنی پێغەمبەریان ﷺ بە واجب دادەنا، هیچ ماناو مەبەستێکیان تیادا نەبوو بۆ زیادەڕەوی کردن تیایدا، بەڵکو هەموو بەڵگەکان کۆك و هاوڕا بوون لەسەر نەهی کردن لەم زیادەڕەوی و تێپەڕاندنە، وە بە هەمان شێوەش ئیمانداران کۆك و هاوڕان لەسەر خۆشویستنی پێغەمبەر ﷺو بەگەورە دانانی و زانینی ئەو پلەو پایەیەی کە شایان وشایستەی پێغەمبەرە ﷺو وە بە بنچینەیەکی ئیمانیشی دەزانن، وە هیچ ناکۆکیەکیش لە نێوانیاندا نیە لەسەر ئەمە، وە ئەوان لە پێشترو شایستەترن لە پڕوپاگەندەو قسە باق و بریقەدارەکانی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانی کە بە گومانی خۆیان خۆشەویستی و بە گەورەدانانی پێغەمبەر ﷺ دەردەبڕن، وە بانگەوازی دەکەن بۆ زیادەڕەوی کردن لە کەسایەتی پێغەمبەری خۆشەویستماندا ﷺ، وە وەك باسیشمان کرد کە تاکە مەبەستیان لەم زیادەڕەوی کردنە تەنها بۆ ئەوەیە کە خەڵکی بە گەورەو پیرۆزیان دابنێن و بگەن بە جاهو پلەو پایەی بەرز تا بتوانن مەبەستە دونیاییەکانیانی پێ دابین بکەن.

❀وە ئەو بەڵگانەش کە باسیان کردن دەربارەی ئەوەی کە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێ بێت لەناو گۆڕەکانیاندا زیندوون، کە ئەمەش ئەو ژیانە نیە کە ئەوان گومانیان بۆ دەبردو دەیانکرد بە شوبهە لە ڕووی خەڵکدا، تا تەوەسولی پێ بکەن و داوای شەفاعەت و کۆمەك و بە فریا کەوتنی لێ بکەن جگە لە خوای گەورە، بەڵکو ئەم بەڵگانە بەڵگەنە لەسەر ژیانێك کە پەیوەندی بە بەرزەخەوە هەیەو خەڵکی سەر زەوی چۆنیەتی و حەقیقەتەکەی نازانن و لێیان نادیارە، وە ئەمەش نەفی مردن و بەردەوامیەکەی تا ڕۆژی قیامەت ناکات لەسەریان، وە بەڵگە شەرعی و عەقڵیەکانیش کۆك و هاوڕان لەسەر ئەمەو هیچ ناکۆکی و ڕاجیاییەك نیە لەسەری.

❀وە بۆمان دەرکەوت کە سەردانی گۆڕستانیش بریتی بوو لە سێ جۆر:

١. سەردان کردنێکی شەرعی: کە ئەویش بۆ سـەلام کـردن لـە مـردووان و دوعـا کردن بۆیان و یادکردنـەوەی دوا ڕۆژ کـە زۆر فـەرمودە هەنـە ئامـاژە بـەو جۆرەیـان دەکەن، وە سەردانی گۆڕی پێغەمبەرانیش سەلامی خوایان لیٚبێت دەچێتە پاڵ ئەم بەشـەیان، چـونکە هـەروەك زۆر لـە زانایـان دەفـەرموون حـوکمی سـەردانی گـۆڕی پێغەمبەران سەلامی خوایان لیٚ بێت هەمان حوکمی سەردانی گۆڕستانی هەیە.

٢. سەردان کردنی بیدعەیی و داهێنراو: ئەوەیە کە مەبەست تیایـدا دوعـا کـردن بێت لای ئەو گۆڕانەو بکرێت بە مزگەوت و سەفەر بکرێـت بـۆ سـەردان کردنیـان، وە زۆر شـتی تـری هاوشـێوەی ئەمانـەش کـە زۆرێـك لـە خـەڵکی ئـەنجامی دەدەن، وە هەموو ئەمانەش نەهی لیٚ کراون" چونکە سەر دەکێشن بۆ شیرك و هاوبەش بۆ خـوا دانان.

٣. جۆری سێیەمیان زۆر لەوانی تر ترسناکترو گەورەترە، چونکە مەبەسـت لـەم سەردان کردنەدا بریتیە لە پاڕانەوە لـە مـردوان و داوا کردنـی شـەفاعەت و بـە فریـا کەوتن و لیٚ خۆش بـوون لێیـان و زۆر شـتی تـریش، کـە ئەمـەش شـیرك و هاوبـەش دانـانێکی ئاشـکراو ڕوونـە، چـونکە چـەندەها بەڵگـە هەیـە لـە قورئـان و سـوننەت و ووتەی زانایان دەربارەی ئەم کارانە، وە وتیشمان کە هیچ جیاوازیەك نیـە لـە نێـوان گۆڕی پێغەمبەران و پیاو چاکان و جگە لەوانیش.

❀وە هەروەها بۆمان ڕوون بۆوە کە تەوەسول کردنیش چەند جۆرێکە:

١. تەوەسولی شەرعی: کە بریتی بوو لە ئیمان و باوەڕ بە خوای گەورەو شوێن کـەوتن و گوێڕایـەڵی کردنـی پێغەمبـەر ﷺ، وە هـەروەها نزیـك بوونـەوە لـە خـوای گەورە بە هەموو ئەوشتانەی کە هۆکاری پیٚ نزیك بوونـەوەن لـە خـوای گـەورەو بـە عیبادەت حیسابن، وە هەر ئەمەش گەورەترین وەسیلەو گەیەنـەرە بـەو شـتەی کـە داوا دەکرێت.

وە هەروەها پاڕانەوە بە ناوە جوانەکانی خوای گەورەو صیفاتە بەرزو پیرۆزەکانی و ئیمان و کردەوە چاکەکان بەشێکن لە تەوەسولی شەرعی.

وە بەهــەمان شــێوە پاڕانــەوەی پێغەمبــەران و پیــاو چــاکان لــە کــاتی ژیانیــان و ئامادەبونیاندا، بە واتای داوا بکرێت لـەوان کـە لەبـەر خـوای گـەورە بپاڕێنـەوە کـە ئەمەش دروستە بە کۆڕای زانایان.

٢. تەوەسولی ناشەرعی: کە ئەمەش بریتیـە لـە تەوەسـول کـردن بـە مـردوان و پێغەمبەران سەلامی خوایان لـێ بێـت، وەك ئـەوەی کـە تەوەسـولیان پـێ بکرێـت و داوایان لێ بکرێت کە بۆت بپاڕێنەوە لە خوای گـەورە لـە کاتێکـدا ئـەوان مـردوون و توانای هیچ شتێکیان نیە، کە ئەمەش بیدعەیـەکی ڕوونـەو لـە سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺو هاوەڵان و دوای ئەوانیش شتی وا باس نـەکراوەو نـەبووە، کەچـی ئـەمڕۆ ئـەم پیاوەو هاوشێوەکانی بانگەشەی بۆ دەکەن و خۆیان و خەڵکیشی پێ گومڕا دەکەن.

وە بەهەمان شێوە کردنیان بە واسیتەو ناوەنـدێك و پاڕانـەوەو داوای بـە فریاکـەوتن لێیان و جێگای ئومێد بـوون جگـە لـە خـوای گـەورە، بەڕاسـتی ئـەوە ئـەو شـیرك و هاوبەش بۆ خوا دانانە ڕاستەقینەیەیە کە ئەو موشریکانەی لەسـەر بـوون کـە خـوای گەورە پێغەمبەری ﷺ بۆ ناردن.

❁وە دیسان بۆمان دەرکەوت کە شەفاعەتیش دوو جۆرە:

١. شەفاعەتی شەرعی: ئەمەش ڕێگە پێـدراوەو جێگیرە بـە بەڵگـەی قورئـان و فەرمودەی صەحیحی پێغەمبەر ﷺ" کـە ئەمـەش حـەق و ڕاسـتە، وەك شـەفاعەتی فریشتەکان و پێغەمبەران و پیاوچاکان، وە ئـەم شـەفاعەتەش نایاتـە دی تـەنها بـە ئیزن و فەرمانی خوای گەورە نەبێت بۆ ئـەو کەسـەی کـە شـەفاعەتەکە دەکـات، وە ڕازیش بێت بۆ ئەو کەسەی کە شەفاعەتی بۆ دەکرێت.

٢. شەفاعەتی ناشەرعی: ئەمەش کە چەندەها شەفاعەتکار دادەنرێـت جگـە لـە خوای گەورە کە ئەمەش دینی موشریکە کۆنەکانە، جا ئەم داوا کردنـی شـەفاعەت و

لێ پاڕانەوەیە لە پێغەمبەران بن سەلامی خوایان لێ بێت، یان کەسێکی تری مردوو بێت یان کەسێکی زیندووش بێت بەڵام لەو کاتەدا ئامادە نەبێ و هاواری بکرێتێ، هەموو ئەمانە دەچنە ناو بازنەی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانانەوە.

وە بەڕاستی ئەوەی جێگای سەیرو سەر سوڕمانە پێداگری و سووربوونی ئەم پیاوەو هاوشێوەکانیەتی لەسەر ئەم بیدعەو گومڕاییەی کە لەسەرنی بەوەی بەردەوامن لەسەر هێنانەوەی شوبهەو پاساو بۆ بیرو بۆچونە گومڕاکانیان، لە کاتێکدا هەموو عەیب و عارەکانیان ئاشکرا بوون و شوبهەکانیان هەڵوەشێنرانەوەو بوونە بڵقی سەر ئاوو چۆکیان دادا لە بەرامبەر بەڵگە ڕاست و دروستەکاندا.

بەڵام ئەم جۆرە کەسانە لە نەفامی و نەزانینەوە ئەم قسان ناکەن، بەڵکو زۆربەیان شارەزان و دینی ڕاستەقینە دەناسن، وە بینیتان کە ئەم بەڵگانەی بە ڕوویاندا درایەوە لە بنچینەکانی شەرع وەرگیرابوون و وەك دیوارێکی بەرز وانە بەرامبەر شوبهەو بیرباوەڕە پوچەڵەکانیان، بەڵام ئەمان شتی وا سەیرو سەمەرە دەڵێن کە خەتەرە بە دڵی هیچ کەسێکی خاوەن عەقلدا ناکات، بەڵکو بە خەیاڵی منداڵانیشدا نایات، ئەی باشە چۆن ئەمانە ئەم شتانەیان لا پەسندە؟!!

بەڵام گومانی تیادا نیە کە خاوەن و هەڵگرانی ئەم بیرو باوەڕە بۆگەن و بەتاڵە شوێنکەوتەی هەواو ئارەزووەکانیانن، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَـٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَـٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾[1]، واتە: (ئایا ئەو کەسە نابینیت کە هەواو ئارەزوی خۆی دەکات بە پەرستراوو خوای خۆی، وە خوای گەورەش گومڕای دەکات کە ئەوەش دیارە خوای گەورە بە زانستی فراوانی خۆی کە ئەو کەسە شایانی هیدایەت

(١) سورة الجاثية: (٢٣).

نیەو مۆر دەدات لە گـویٚ و دڵـی و پـەردە بەسـەر چـاوەکانیدا دەدات، وە جگـە لـە خوای گەورە کیٚ دەتوانێت هیدایەتی بدات).

وە ئەوەش کە دەریدەخات کە هەڵگرانی ئەم بیرو باوەڕە بۆگەن و پڕ لە شـیرکە بـە بوونی زانیاریەوە ئەم قسانە دەکەن و سوورن لەسەر ئەم بیرو بۆچونە گومڕایـەیان، ئەوەیە ئەم شوبهانەی کە دەیهێننەوە ئەو حەقەی کە تیایدایـەتی دەیـشارنەوەو لـە مانا ڕاستەقینەکەی خۆی لایدەدەن و تەحریفی دەکەن، وە قسەی ناحەق و نابەجیٚ بە نـاوی خـوای گـەورەو پێغەمبـەرەوە ﷺ دەکـەن، وە هـەروەها کۆمـەڵێك قـسەو کردەوە دەخەنـە پـاڵ هـاوەڵان ڕەزای خوایـان لـیٚ بێـت و پێـشەوایانی ئیـسلام کـە بەڕاستی ئەوان بەرینە لە هەموو ئەمانە، هەر ئـەم بەڵگـە هێنانەوەشیانە کـە ئـەوە دەسەلمێنێت ئەوان لە نەزانی و جەهلەوە ئەم قسانە ناکەن، چونکە ئـەم قـسانە لـە کەسێك دەرناچێت کە جاهیل و نەزان بێت بە بنچینەو بنەماکانی ئیسلام، وە کەسی جاهیل و نـەزان هەرچـەندە هەڵـەو کەموکورتیـشی هـەبێت، ئـەوا ناتوانێـت کـە ئـەم هەڵانەی خۆی بپۆشێت و بەڵگەیان بۆ بهێنێتەوەو ماناکەیان بگۆڕێت بۆ سەرخستنی هەڵەکانی.

وە هەروەها هیچ ڕێی تیٚ ناچێت کە کەسێکی نەشارەزاو نەزان بتوانێت لێکۆڵینـەوە بکات لە کتێبەکانی تەفسیرو فەرمودەو مێژوو جگە لەوانیش بۆ دەرهێنانی ئەو قسە دەگمـەن و فـەرمودە غـەریب و هەڵبەسـتراوو ..... هتـد، وە بـەکاریان بهێنێـت بـۆ پشتگیری لە بیرو بۆچونە هەڵەکانی.

بۆ نمونە ئایەتێك وەربگرە کە دەیهێننەوەو دەیکەن بە بەڵگە بۆ ئەوەی بیـسەلمێنن کە دروستە سـەردانی گـۆڕی پێغەمبـەر ﷺو سـەفەر کـردن بـۆی و تەوەسـول پـیٚ کردنی و داوا کردنی شەفاعەت لێی و داوای لیٚ خۆش بوون کردن لێی[1]، ئەویش ئەم

---

(١) من خۆم ئەم پیاوەم بینی (محمد العلوي) لە کەناڵی ئاسمانی (إقرأ) کە سەر بە تـاقمی (إخوان المـسلمين)ە، لـە چاوپێکەوتنێکدا کە لە گەڵیدا ئەنجامیان دابوو، ئەم ئایەتەی هێنایەوەو وتی: (داوای لیٚ خۆش بوون کردن و .

ئایەتە پیرۆزەیە كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾[1]،
واتە: (وە ئەگەر ئەوانەی كە زوڵم و ستەمیان لە نەفسی خۆیان كردووە بێن بۆ لات و داوای لێ خۆش بوون بكەن لە خوای گەورەو وە پێغەمبەریش ﷺ داوای لێ خۆش بوونی بۆ كردن -كە ئەمەش تایبەتە بەو كاتەی كە پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا بووە- ئەو كاتە بۆیان دەردەكەوێت كە خوای گەورە زۆر تەوبە قەبوڵ دەكات و بە سۆزو بە زەییە لە بەرامبەر بەندەكانی).

وە ئەم ئایەتە پیرۆزە هیچ ئاماژەیەكی تیادا نیە نە لە دورو نە لە نزیك دەربارەی ئەوەی كە ئەوان دەیڵێن، وە ئەمەشیان نە لە هاوەڵان و نە لە شوێن كەوتوانی ئەوان وەرنەگرتووە، وە هیچ بەڵگەیەكیان پێ نیە كەوا ئەم ئایەتە بەم شێوەیە تەفسیر بكرێت.

وە ئەم ڕێبازەش كە ئەم پیاوەو هاوشێوەكانی و دەروێشەكانیانی بۆ بانگ دەكەین، مەزهەبێكی تازە داهێنراوو دینێكی تازە نیە، بەڵكو ئەو شارێگەیەیە كە دەبەسترێتەوە بە پێغەمبەر ﷺو هاوەڵە بەڕێزەكانی و شوێن كەوتوانیان، كە هەر ئەمەش مەزهەب و ڕێبازی پێشەواو زانا بەڕێزو پایە بەرزەكانی وەك ئیمامی مالیك و ئەبو حەنیفەو ئیمامی شافیعی و ئیمامی ئەحمەدو چەندەها زانای پایە بەرزی تری ئەم ئوممەتەیە لە هاوشێوەكانیان لە هەڵگرانی سوننەتی پاك و بێگەردی پێغەمبەری خوا ﷺ.

وە بۆمان دەركەوت كە ئەم پیاوەو هاوشێوەكانی هیچ بەڵگەیەكیان پێ نیە كە لەو ئیمام و پێشەوا باوەڕ پێكراانەیان وەرگرتبێت كە فەتوایان دابێت و بڵێن دروستە

---

سەردان كردنی پێغەمبەر ﷺ دروستەو هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان ئەوەی كە لە ژیاندا بێت یان نا) (نوسەر).

(١) سورة النساء: (٦٤).

زیادەڕەوی كردن لە پێغەمبەر ﷺ و پاڕانەوە لێی و داوای بە فریا كەوتنی لێ بكرێت، وە نەیان وتووە دروستە داوای لێ خۆش بوون بكرێت لە لای گۆڕەكەی یان دوور لە گۆڕەكەی، وە هیچ كام لەم پێشەوا بەڕێزانە نەیان وتووە كە پێغەمبەر ﷺ ئاگای لە نیەتەكانەو كلیلەكانی غەیب و ڕۆح دەزانێت، وە نەیان وتووە كە پێغەمبەر ﷺ ناونراوە بە زیاتر لە (٧٠) ناوی خوای گەورە وەك (الأول والآخر والظاهر والباطن).....هتد.

وە هیچ كام لەمانە نەیان ووتوە كە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ گەورەترو پیرۆزترە لە عەرشی خوای گەورەو فیردەوس، یان فریشتەكان لەبەر خاتری پێغەمبەر ﷺ سوجدەیان بۆ ئادەم بردووە.

بەڵكو هەموو ئەمانەیان لە كەسانێك وەرگرتووە كە لە دوای سەردەمی پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان و سێ سەدە پڕ خێرەكەی دوای ئەوان هاتوون، لەوانەی كە پێچەوانەی ڕێبازی ئەوانیان گرت و زانایان و ئیماندارانی ڕاستەقینە كارەكانی ئەوانیان بە هەڵە دانا، چونكە پێچەوانەی ئەم ڕێبازە بوو كە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەسەر بوون.

وە دیسان بەم پیاوەو هاوشێوەكانی و دەروێشەكانی دەڵێین ئەوەی كە ئێمە بانگی ئێوەی بۆ دەكەین دینێكی ڕاستەقینەو ڕێبازێكی سەلامەتە، ئەویش ئەو دین و ڕێبازەیە كە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی لەسەر بوون، وە هەر كەسێكیش واز لە زیادەڕەوی كردن بهێنێت لە پێغەمبەر ﷺ و دەست بگرێت بەوەی كە پێی وەصف كراوە لە قورئان و سوننەتداو ئەوەش كە هاوەڵان ڕەزای خوایان لێ بێت وتویانە دەربارەی، ئەوا بەڕاستی ئەو كەسە بە كەمتەرخەم ناژمێردرێت لە بەرامبەر حەقی پێغەمبەر ﷺ.

وە لە كۆتاییدا داواكارم لە خوای گەورەو باڵا دەست و لێی دەپاڕێمەوە بە ناوە جوان و صیفاتە بەرزو پیرۆزەكانی كە هیدایەت و ڕێنومایی هەموو لایەكمان بكات بۆ ڕێگا ڕاستەكەی خۆی، وە بمان گێڕێت لەو كەسانەی كە گوێ لە قسەكان دەگرن و

شوێن باشترین قسەیان دەکەون، وە هەموولایەکمان بپارێزێت و دوورمان بخاتەوە لە فیتنەو بەڵاو موصیبەت و لاڕێ بوون و سەر لێ شێوان و گومڕایی، وە ئەوەش کە توشی هەڵەو لادان و لاڕێ بوون بووەو شەیتان فێڵی لێ کردووەو کەوتۆتە ناو زۆنگاوی شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان و گومڕاییەوەو توشی گێژاوی بە هیلاك دەری بیدعە بووە، بیگەڕێنێتەوە سەر شاڕێگە ڕاست و دروستەکەی خۆی بە جوانترین و باشترین گێڕانەوە..... آمین

وصلى الله و سلم وبارك على سيد الأنام، نبينا محمد وعلى آله وصحبه والتابعين لهم بإحسان.

١٢/شعبان/١٤٣٠ کۆچی

٣/ئاب/٢٠٠٩ زایینی

# پێرستی بابەتەکان

**بابەت** **لاپەڕە**

